# ڕەد دانەوەی ئەهلی بیدەع و هەڵوێستی سەلەف دەربارەیان

نوسینی

هەڵمەت عبداللە

# پێرست

# پێشەکی

بسم الله وما توفيقي إلا بالله

الحمدلله رب العالمين والعاقبة للمتقين، وصلى الله على محمد خاتم النبيين وعلى جميع الأنبياء والمرسلين، الحمدلله قبل كل كلامٍ، وله الحمد في كل مقامٍ، وعلى محمدٍ صلوات ربنا وعليه أفضل السلام، أما بعد:

ئوممەتی ئیسلام ئوممەتی پێغەمبەرێکە کە الله ﷻ وەک ئاخیر پێغەمبەر ناردی هەتا هەرچی کوفر و شیرک هەیە بیسڕێتەوە، وە هەرچی تاریکی بیدعە هەیە بە ڕووناکی سوننەت ڕۆشنی بکاتەوە، ئەو پێغەمبەرە ﷺ لە دونیا دەرنەچوو هەتا ئەو دینەی بە کامڵی گەیاندە شوێنکەوتوانی، هیچ کەلێن و نەقصێکی تێدا نەهێشتەوە، وە پێی ڕاگەیاندین دینەکە کامڵ بووە پێویست بە زیادکردن ناکات، بۆشی ڕوون کردینەوە هەموو زیادکردن و داهێنانێک تیایدا گومڕاییە و مەقبول نییە و ڕەد دەکرێتەوە: « أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ خَيرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّه، وَخَيرُ الْهُدَى هُدَى مُحَمَّد، وَشَرُّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ ». « مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ ».

بیدعە ئەو ئاگرەی کە سوتێنەری عەمەلی ئینسانە، ئەهلی بیدەع ئەو هێزەن کە سوتەمەنی ئاگرەکە زیاد دەکەن، لە بەرامبەردا ئەهلی سوننە ئەو ئاوەن کە ئاگری بیدعە و ئەهلەکەی دەکوژێننەوە.

ئێستا سەردەمی فیتنەیە کەوتووینەتە زەمانێک زۆرێک لە خەڵکی بە چاوێکی سووک و ئاساییانە سەیری بیدعە دەکەن، ئەهلی بیدەع دەقەکانی شەرعیان وەک لاستیکێک لێکردووە بە هەر جۆرێک بیانەوێ ڕایدەکێشن، بەو جۆرەی ویستیان لێیبێ لەگەڵ هەوا و ئارەزووی ئەو گومڕاییەی کە لەسەرینی ڕێکی دەخەن و دەیگونجێنن، بۆ نمونە دەچن حدیثێک دەهێنن باسی ئەهلی حەقە، بەڵام ئەمان تەنزیلی دەکەنە سەر گومڕایی و بیدعەکەی خۆیان، لەو لاشەوە هەوادار و شوێنکەوتەکانیان وا دەزانن ئەوە حەقیقەت و ئەصڵەکەیە لەکاتێکدا باتڵە سەرابەکەی بیابانە ئەمان وەک ئاو دەیبینن.

ئینسانی ئیماندار و ئەهلی سوننە دەبێ عەقیدەی لەسەر الولاء والبراء بنیاد بنێ، ئەهلی ئیمانی خۆشبوێ لەگەڵیان هەڵسوکەوت بکات و ببینرێ، هەموو پێکەوە وەک دیوارێکی پتەو خۆیان لە تەنیشت یەک ببیننەوە، وە ڕقی لە ئەهلی بیدەع و باتڵ بێ بە هەموو گرووپەکانیانەوە، ئەوانەیان کە

بیدعەکانیان کوفرە، وە ئەوانەشیان کە بیدعەکانیان ناگاتە حەدی کوفر، بەڵکو فجور و فیسقن، هەمیشە بە وتە و عەمەل وەک مێخێک لە ڕوویاندا بوەستێتەوە.

مەسئەلەی بیدعە و ئەهلەکەی لای ئەهلی سوننە بە گەورە و مەترسیدار تەماشا کراوە، بە پێچەوانەی گومڕاکانەوە کە ئەمە بەلایانەوە مەسئەلەیەکی سادە و ئاسانە لایان ئاساییە تەعامول و هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ بیدعەچی نەک ئەوە بگرە تێکەڵی و برایەتیش لەگەڵ موشریک بەلایانەوە هەر ئاساییە! لەم ڕووەوەیە دەبینی أبو علي فضيل بن عياض لە وەصف و مەترسی ئەهلی بیدەع دەڵێ: ئەگەر پیاوێک ببینم لە ئەهلی سوننە وا دەزانم پیاوێکم بینیوە لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ، وە ئەگەر هاتوو پیاوێک ببینم لە ئەهلی بیدەع ئەوە وا دەزانم پیاوێکم بینیوە لە مونافیقەکان.

قال فضيل بن عياض: إذا رأيت رجلاً من أهل السنة فكأنما أرى رجلاً مِن أصحاب رسول الله ﷺ، وإذا رأيت رجل من أهل البدع فكأنما أرى رجلًا مِنَ المنافقين.

شرح السنة للبربهاري | صـ : ٢٨

سەلەف هەموو یەک دەنگ بوون لەوەی نابێ هاوڕێیەتی ئەهلی بیدەع و ئەهلی کەلام بکرێ، ئەهلی کەلام بە هەموو جۆرەکانیانەوە، وەک: «جەهمییە، موعتەزیلە، ئەشاعیرە».

چونکە هاوڕێیەتی و تێکەڵ بوون لەگەڵیان هۆکارێکە بۆ توشبوون بە بیدعە و ڕۆچوون تیایدا، هەروەها توشی گومان و سەرگەردانیت دەکەن، هەتا ئەگەر شەخصێک کە تێکەڵ دەبێ لەگەڵیان، ئەوپەڕی هەوڵیش بدات خۆی بپارێزێ لێیان و نەبێتە هەڵگری عەقیدەیان، بەڵام بکەوێتە ڕەتدانەوەیان و نقڵ کردنی شوبهەکانی ئەهلی بیدەع و هەموو وتە باتڵ و کوفرییەکانی ئەهلی کەلام، بەم کارەی سەرەنجامی ئەو نەهیەی سەلەفی بۆ دەردەکەوێ، چونکە بەو نەقڵ کردنەی، ئەو بیدعە و کوفرەی لای زۆربەی خەڵکی شاراوە بووە، ئەم هەستاوە بەدەرخستنی بۆیان و بەمەش خەڵکانێکی زۆری عەوام تووشی گومان و شوبهات دەبن، هەروەک چۆن دەبینی لەم جۆرە حاڵەتەدایە عبدالله بن مبارک وتوویەتی: « ئێمە دەتوانین کەلامی یەهود و نەصارا بگێڕینەوە باسی کوفرەکانیان بکەین، بەڵام ناتوانین کەلامی جەهمییەکان باس بکەین ». وە ئەگەریش بچێتە مونازەرە و جیدال لەگەڵیان، دووبارە تووشی ئەو

نەهیە بووە کە سەلەف باسیان کردووە، چونکە بەو مونازەڕە و جیداڵە عەقیدە باتڵەکەی بەرامبەر دەردەکەوێ، وە هۆکارێکیشە بۆ تەرک کردنی عەمەل، لەکاتێکدا لە سەلەفەوە وارد بووە وتوویانە: « ئەگەر الله ﷻ بیەوێ شەڕ و خراپە تووشی قەومێک بکات ئەوە مولزەمیان دەکات بە جیدالەوە، وە مەنعی عەمەلیان لێدەکات مەشغوڵیان دەکات بە جیدالەوە هەتا ئەو ئاستەی عەمەلیان بیردەچێتەوە ».

تەماشای واقعی ئەمڕۆ بکەن وەرەن زۆربەی ئەوانەی خۆیان بە دەعوەکاری ئەهلی سوننە دەزانن، کاتێک بە ئەقوال و عەمەلی ئەهلی سوننە هەڵیان دەسەنگێنی دەبینی لە بەرامبەر ئەهلی بیدەعدا وەک تکی ئاو نەرمن، ئەگەر پێوانەیان بکەی بەو قەولەی فضیل بن عیاض ئەوکات بۆتان ڕوون دەبێتەوە چەندە شل و فشۆڵن.

کاتێک ئینسان تووشی بیدعە دەبێ و دینداری بەو بیدعەیە دەکات و شوێن حەق و وتەی سەلەف ناکەوێ، ئەوە عیلم و حەق بەلایەوە دەبێتە جەهل و بە جەهل تەماشای دەکات، بەم جۆرە دەبێتە کەسێکی جاهیل، جا ڕەحمەتی الله لە شافعي بێ کە دەڵێ: عیلم لای ئەهلی جەهل جەهل

و جاهل بوونە، هەروەک چۆن جەهل جەهل و جاهل بوونە لای ئەهلی عیلم، پاشان ئەم شیعرەی لەو بارەیەوە وتووە:

ومنزلةُ السفيهِ من الفقيه ... كمنزلة الفقيه من السفيه

فهذا زاهد في قُرْبِ هذا ... وهذا فيه أَزْهَدُ مِنهُ فيه

قال المزني، قال الشافعي: العِلمُ جهلٌ عند أهل الجهلِ، كما أَنَّ الجهلَ جهلٌ عند أهل العلم، وأَنشدَ فيه:

ومنزلةُ السفيهِ مِنَ الفقيه ... كمنزلة الفقيه مِنَ السفيه

فهذا زاهد في قُرْبِ هذا ... وهذا فيه أَزْهَدُ مِنهُ فيه

الفقيه والمتفقه للخطيب ا ٧٦٨

هەڵمەت عبدالله

هەڵەبجە ا شەممە

٢٩/ربيع الأول/١٤٤٥

# دەسپێک و کاری ئێمە لەم کتێبەدا

الحمدلله ئەم کتێبە جامعێکە لە ئەقوالی سەلەف لە ڕەدی بیدعە و ئەهلی بیدەع، تا ڕادەیەکی باش هەوڵمداوە هەرچی قەول هەبێ لەو سەرچاوانەی کە مەوجوودن لە بەردەستمدا بیانهێنم، وە دابەشم کردووە بەسەر شەش فەصڵدا، هەر شەش فەصڵەکەم شەحن کردووە بە عەقیدە و ئەقوالی خير القرون و سەلەف و ئەهلی سوننە.

١- مەترسی بیدعە لەسەر دینی ئینسان: لەم بەشەدا ئەو حدیثانەم هێناوە کە هەڕەشەیان تێدایە بۆ سەر بیدعە و ئەهلی بیدەع، لەگەڵ ئەقوالی صەحابە و تابعین و ئەتباعی تابعین و سەلەفم هێناوە کە زەجری ئەهلی بیدەعیان کردووە.

٢- هەجر کردنی ئەهلی بیدەع و سووک کردن و دوورخستنەوەیان: لەم بەشەدا چەند نمونەی هەجری ئەهلی بیدەع و ئەهلی شوبهاتم هێناوەتەوە لەسەردەمی صەحابە رضوان الله عليهم چۆن تەمیە کراون و هەجر کراون و نەفی کراون، نمونەی صبيغ بن عسل ـم هێناوەتەوە لە سەردەمی خەلیفە عمر بن خطاب رضي الله عنه، هەروەها نمونەی معبد الجهني لە

سەردەمی تابعین، وە چەند نمونەی تر و هەڵوێست و ئەقوالی ئەهلی سوننە بەرامبەریان.

٣- تەرک کردنی هاوڕێیەتی ئەو کەسانەی دەبنە نەخۆشی بۆ دڵ: لەم بەشەدا بە چڕی ڕێگری سەلەف و ئەهلی سوننەم هێناوە کە چەندە توند بوون بەرامبەر ئەهلی بیدەع و ڕێیان نەداوە ڕەفیقایەتییان بکرێ، بە هەموو هێزێکیان بەرامبەریان وەستاونەتەوە و خەڵکیان لێیان ئاگادار کردووەتەوە.

٤- نەهی کردن لە جیدال و مونازەرە لەگەڵ ئەهلی بیدەع: لەم بەشەدا ئەقوالی سەلەفمان هێناوە چەندە توند بوون دەربارەی مونازەرە و جیدال لەگەڵ ئەهلی بیدەع، بەڵکو ئامۆژگاری ئەهلی سوننەیان کردووە ئەوەی حەقە بیڵێن، ئەمما بچنە ناو جیدال و موناقەشە ئەوە نەخێر ڕێیان نەداوە، هەر موبتەدع و ئەهلی باتڵێک داوای لێکرد بن، ئەمان ڕەتیان کردووەتەوە و وتوویانە: ئێمە گومانمان نییە لە دینەکەمان، بڕۆ دینەکەت بدۆزەرەوە، یاخود کەسێکی وەک خۆت بدۆزەرەوە بەگومان بێ لە دینی پێکەوە موناقەشە بکەن، تەنها لە سێ حاڵەتی تایبەتدا ڕێیان داوە کە لە شوێنی خۆیدا هێناومانە.

٥- زەمی کەلام و ئەهلەکەی لای ئیمامی شافعی و ئیمامی أحمد: ئەم بەشەمان تایبەت کردووە بە ئەقوالی هەردوو أبو عبدالله: محمد بن إدريس الشافعي، أحمد بن محمد بن حنبل الشيباني رحمهم الله، کە یەکێک بوون لە ئەئمەی سەلەف زۆر توند بوون بەرامبەر ئەهلی بیدەع بە هەموو صینفەکانیانەوە، هەمیشە پێشەنگ بوون لە ڕەد دانەوە و وسکت کردنیان.

٦- غەیبەتی ئەهلی بیدەع و باس کردنی حاڵ و عەیبەکانیان: لەم بەشەدا ئەقوالی سەلەفمان هێناوە کە هەموو یەک دەنگ بوون لەوەی دەبێ باسی ئەهلی بیدەع بکرێ، وە باتڵی مەنهەج و قەولەکانیان بەیان بکرێ، هەرکەسێکان چ صیفەتێکی تێدایە بەو صیفەتە ناوی بهێنرێ، بۆ نمونە شەخصێک خاوەن بیدعە بووبێ یاخود درۆزن و فاجر و فاسق بووبێ یان کەم عەقڵ و خەڵەفاو بووبێ، ئەوە دەرخستنی ئەم حاڵەتەی بۆ خەڵکی غەیبەت نییە، بەڵکو لای سەلەف وەک عیبادەت و ئەمر کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە سەیر کراوە و گەیاندوویانە.

پاشان مەنهەجی بەندە لە هێنانی حدیث و قەولەکاندا بەم شێوازەیە هەر حدیث و قەولێکم هێنابێ لەگەڵ سەنەدەکەی هێناومە، پاشان تەخریجی

ئەو حدیث و قەولەم داناوە، جاری وا هەیە قەولێک لە لایەن نۆ شێخەوە ڕیوایەت کراوە، ئەو سەنەدەی قەولەکەم پێی هێناوە هی یەکەم شێخە کە لە خوارەوەی قەولەکە یەکەم جار ناوی کتێبەکەیان داناوە، بۆ نمونە وەک ئەم خەبەرە: أخبرنا سليمان بن حربٍ، عن حماد بن زيدٍ، عن أيوبٍ قال: قال أبو قِلابة: لا تُجالسوا أهل الأهواء، ولا تُجادلوهم، فإني لا آمنُ أن يغمسوكم في ضلالتهم، أو يلبسوا عليكم ما تعرفون.

سنن الدارمي ا ٤٠٣ كتاب القدر للفريابي ا ٣٧٠ كتاب البدع لابن وضاح ا ١٣٢ كتاب السنة للخلال ا ١٩٢٧ كتاب الشريعة للآجري ا ١١٤ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٣٩٤ كتاب أصول السنة لابن أبي زمنين ا ٢٤٣ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٤٤ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٨٣٣

شێخەکانی تر لە هەمان تەریقی ئەوەوە ئەثەرەکەیان ڕیوایەت کردووە، یاخود لە ڕێگەیەکی ترەوە هێناویانە، جا ئامانجمانە لەم کارە ئەوەیە خوێنەر ئاسان بتوانێ بگەڕێتەوە بۆ ئەو قەولانە، چونکە مەرج نییە هەموو طالب عیلم و خوێنەرێک هەموو ئەو کتێبانەی هەبێ کە ئیشارەتمان پێیان داوە، دەکرێ دووانیانی هەبێ یاخود دانەیەکیان، کاتێک هەموو

سەرچاوەکان دانراون و حەزبکات بچێتەوە سەر ئەو وتەیە لە یەکێک لەو کتێبانەی کە تیادا هاتووە ئەوکات لە لای خۆی ئاسان دەتوانێ بچێتەسەر ئەو قەولە، وایدانێ بەس کتاب السنة للخلال ـی هەیە، ئەگەر ئێمە بەس ئاماژەمان بە تەخریجی سنن الدارمی بدایە، ئەوە ئەم شەخصە کە بەس کتاب السنه ـی لە کتێبخانەکەیدا هەیە نەیدەتوانی بگەڕێ بە دوای ئەم قەولەدا هەتا ڕاستەوخۆ بە شێوەی موعایەنە سەیری بکات، بەمەش کار ئاسانیمان کردووە بۆ خوێنەر.

خاڵێکی تر ئەوەیە ئەگەر ئەثەرێک چەند شێخێک ڕیوایەتیان کردبێ، بەڵام لەفظی هەندێکیان جیاوازی هەبێ لەگەڵ لەفظی هەندێکی تریان، ئەوە ئاماژەم پێیداوە، وە هەردوو لەفظەکەم هێناوە، وەک ئەم ئەرە: أخبرنا سليمان بن حَربٍ، حدثنا حماد بن زَيدٍ، عن أيوبَ، قال: رآني سعيد بن جُبَير جَلَستُ إلى طَلقِ بن حبيبٍ، فقال لي: أَلَم أَرَكَ جَلَستَ إلى طَلقِ بن حبيبٍ؟ لا تُجالِسَنَّه.

سنن الدارمي ا ٤٠٤ كتاب السنة لعبدالله ا ٦١١ كتاب السنة للخلال ا ١٥٢٥ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ١٣٢٠ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ١٨١٠ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٧٩٢

ئەم ئەثەرە لای عبدالله بەم لەفظە هاتووە: قال سعيد بن جبير غير سائلةِ ولا ذاكرًا ذاكَ له: لا تُجالس طَلقًا، يعني: أنه كان يرى رأي المُرجئة.

لای الخلال ـيش بەم لەفظە هاتووە: قال لي سعيد بن جبير غير سائلةِ ولا ذاكرًا له ذالكَ: لا تُجالس طَلقًا.

وە لای إبن بطة بەم لەفظە هاتووە: قال لي سعيد بن جبير: ألم أراك مع طَلقٍ؟ قال: قلت: بلى، فما له؟ قال: لا تجالسه، فإنه مُرجئ. قال: أيوب: وما شاورته في ذالك، ولكن يحق للمسلم إذا رأى من أخيه ما يكره أن يأمره وينهاه.



# مەترسی بیدعە لەسەر دینی ئینسان

**جابر بن عبدالله** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ هەرکات وتاری بدایە چاوەکانی سوور دەبوون، وە دەنگی بەرز دەکردەوە، وە تووڕەیی زیادی دەکرد، هەتا کەئەنەما هەواڵی هاتنی سوپایەک دەدات و دەڵێ: بەیانی یان ئێوارە دەدات بەسەرتاندا، وە دەیوت: « ناردنی من لەگەڵ هاتنی قیامەت وەک ئەم دوو پەنجە وایە ». هەردوو پەنجەی شەهادە و ناوەڕاستی بەرز دەکردەوە، وە دەیوت: « أما بعد، چاکترین وتە کتابی الله ـیە، وە چاکترین ڕێگا و ڕێنمونی، ڕێنمونی محمد ـە، وە خراپترین کردار داهێنراوەکانن، وە هەموو بیدعە و داهێنراوێک گومڕاییە ».

وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثَنَا عَبْدُالْوَهَّابِ بْنُ عَبْدِالْمَجِيدِ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِالله رَضِيَ اللهُ عَنهُما، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا خَطَبَ احْمَرَّتْ عَيْنَاهُ، وَعَلَا صَوْتُهُ، وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ، حَتَّى كَأَنَّهُ مُنْذِرُ جَيْشٍ يَقُولُ: صَبَّحَكُمْ وَمَسَّاكُمْ، وَيَقُولُ: « **بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةَ كَهَاتَيْنِ** ». وَيَقْرُنُ بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى وَيَقُولُ: « **أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّه، وَخَيْرُ الْهُدَى هُدَى مُحَمَّدٍ، وَشَرُّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ** ».

صحيح مسلم | ٢٠٠٥ سنن النسائي | ١٥٧٨ سنن ابن ماجه | ٤٥ سنن الدارمي | ٢١٤ مسند أحمد | ١٤٣٣٤

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: هەموو بیدعە و داهێنراوێک گومڕاییە، هەرچەندە خەڵکی بە چاکە ببینن و تەماشای بکەن.

حدثنا حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا أبو بكر بن أبي شيبة، قال: حدثنا شبابة بن سوَّار، عن هشام، عن نافع، عن ابن عمر رضي الله عنهما، قال: كُلُّ بِدعَةٍ ضَلَالَة وَإِن رَآهَا النَّاس حَسَنَةً.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٢١٧ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ١٢٦

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: « هەرکەسێک شتێک لە ئەمری دین دابهێنێ ئەوە قبوڵ ناکرێ و ڕەتدەکرێتەوە ».

حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ** ».

صحيح البخاري | ٢٦٩٧ صحيح مسلم | ٤٤٩٢ سنن أبي داود | ٤٦٠٦ سنن ابن ماجه | ١٤ مسند أحمد | ٢٦٠٣٣

أبو هريرة رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: « وازم لێ بهێنن لەوەی من تێیدا وازم لێ هێناون ئەوەی بۆم هێناون و ئەمری زیاترم پێتان نەکردووە لەسەری ڕاوەستن و داوای زیاتر مەکەن، ئوممەتانی پێش ئێوە تیاچوون بەهۆی ئەوەی پرسیاریان لە پێغەمبەرەکانیان دەکرد و موخالەفەیان دەکردن، هەر شتێک نەهیم کردبێ لێی خۆتانی لێ لادەن، وە ئەمرم کردبێ بە هەر شتێک بە پێی تواناتان ئەنجامی بدەن ».

حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنِي مَالِكٌ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الْأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: « دَعُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِسُؤَالِهِمْ وَاخْتِلَافِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَاجْتَنِبُوهُ، وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ ».

صحيح البخاري | ٧٢٨٨ صحيح مسلم | ٦١١٣ مسند أحمد | ٧٥٠١

أبو هريرة رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: « الله جَلَّ جَلَالُهُ ڕازییە لێتان لە ئەنجامدانی سێ کردەوە، وە نەهی لێکردوون لە سێ

کردەوەش کەراهەتی هەیە بۆتان، ڕازییە لێتان کە بیپەرستن و شەریکی بۆ بڕیار نەدەن، وە دەس بگرن بە دینی الله ـەوە، وە تەفرەقە و پەرتەوازە مەبن لە نێوان خۆتاندا، وە بە کەراهەتی دەبینێ وتی وتی قەولی ئەم و ئەو، وە زۆر پرسیار کردن، وە ماڵ بە فیڕۆدان ».

حَدَّثَنِي زُهَيْرُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ سُهَيْلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « إِنَّ اللَّهَ يَرْضَى لَكُمْ ثَلَاثًا، وَيَكْرَهُ لَكُمْ ثَلَاثًا، فَيَرْضَى لَكُمْ أَنْ تَعْبُدُوهُ، وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَأَنْ تَعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللهِ جَمِيعًا، وَلَا تَفَرَّقُوا، وَيَكْرَهُ لَكُمْ قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ ».

صحيح مسلم | ٤٤٨١ مسند أحمد | ٨٣٣٤

إبراهيم التيمي لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: علي بن أبي طالب رضي الله عنه وتی: ئێمەی ئەهلی بەیت جگە لە کتێبی الله ﷻ هیچ کتێبێکی ترمان نییە جیاواز بێت و تایبەت بێ بە خۆمان، تەنها ئەمە نەبێ لەم صەحیفەدا نوسراوە. کاتێک دەری هێنا تیایدا باسی هەندێک فیدیەی تێدا بوو، لەگەڵ فیدیەی خوێنی ددان شکاندنی حوشتر، وتی: تیایدا

نوسراوە: « مەدینە حەرەمە لە نێوان شاخی عیر هەتا شاخی الثور، هەرکەسێک بیدعەیەکی تێدا دابهێنێ، یاخود موبتەدعێک داڵدە بدات، ئەوە لەعنەتی الله و مەلائیکە و هەموو خەڵکی لێبێ، لە ڕۆژی قیامەتتدا الله ﷻ هیچ فەڕز و سوننەتێکی لێ وەرناگرێ ... ».

حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: مَا عِنْدَنَا كِتَابٌ نَقْرَؤُهُ إِلَّا كِتَابُ اللَّهِ غَيْرَ هَذِهِ الصَّحِيفَةِ. قَالَ: فَأَخْرَجَهَا، فَإِذَا فِيهَا أَشْيَاءُ مِنَ الْجِرَاحَاتِ، وَأَسْنَانُ الْإِبِلِ، قَالَ: وَفِيهَا: « **الْمَدِينَةُ حَرَمٌ مَا بَيْنَ عَيْرٍ إِلَى ثَوْرٍ، فَمَنْ أَحْدَثَ فِيهَا حَدَثًا، أَوْ آوَى مُحْدِثًا، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لَا يُقْبَلُ مِنْهُ يومَ الْقِيَامَةِ صَرْفٌ وَلَا عَدْلٌ** ... ».

صحيح البخاري | ٦٧٥٥ صحيح مسلم | ٣٣٢٧ سنن أبي داود | ٢٠٣٤ سنن الترمذي | ٢٢٦٠ مسند أحمد | ٦١٥

**أبو هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « قیامەت بەرپا نابێ هەتا ئوممەتەکەم بست بە بست، وە باڵ بە باڵ شوێن کەسانی پێش خۆیان دەکەون ». وتیان: یا ڕەسول الله، وەک فارس و ڕۆم؟ فەرمووی: « خەڵک کێیە بێجگە لەوان ».

حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: « **لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَأْخُذَ أُمَّتِي بِأَخْذِ الْقُرُونِ قَبْلَهَا، شِبْرًا بِشِبْرٍ، وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ** ». فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَفَارِسَ وَالرُّومِ؟ فَقَالَ: « **وَمَنِ النَّاسُ إِلَّا أُولَئِكَ** ».

صحيح البخاري | ٧٣١٩ مسند أحمد | ٨٣٠٨

**أبو سعيد الخدري** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « شوێن پێی ئوممەتانی پێش خۆتان دەکەون، بست بە بست، باڵ بە باڵ، هەتا ئەگر بچنە ناو کونی بزن مژەوە ئێوەش دەچن ». وتمان: یا ڕەسول الله، مەبەستت جوولەکە و نەصارایە؟ فەرمووی: « ئەی مەبەستم کێیە ».

حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ، حَدَّثَنَا أَبُو عُمَرَ الصَّنْعَانِيُّ مِنَ الْيَمَنِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: « **لَتَتْبَعُنَّ سَنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، شِبْرًا شِبْرًا، وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ، حَتَّى لَوْ دَخَلُوا جُحْرَ ضَبٍّ تَبِعْتُمُوهُمْ** ». قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ: « **فَمَنْ** ».

صحيح البخاري | ٧٣٢٠ صحيح مسلم | ٦٧٨١ مسند أحمد | ١١٨٠٠

**زياد بن علاقة** لە مامیەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ ئەم دوعایانەی دەکرد: « اللهم بە دوورم بخەی لە مونکەراتی ڕەوشت و هەوا و ئارەزوو، وە نەخۆشییەکانی دڵ ».

حَدَّثَنَا ابنُ أَبي شَيْبَة، حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَة، عَنْ مِسْعَرٍ، عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلاَقَة، عَنْ عَمِّه، قال: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدْعُو بِهَؤُلَاءِ الدَّعَوَات: « **اللَّهُمَّ جَنِّبْنِي مُنْكَرَاتِ الْأَخْلَاقِ، وَالْأَهْوَاءِ، والْأَدْوَاءِ** ».

كتاب السنة لابن أبي عاصم | ١٣

**أبي برزة الأسلمي** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « ئەوەی دوای وەفاتی خۆم ترسم هەیە لەسەرتان سک و داوێن و گومڕایی و هەوا و ئارەزووەکانە ».

حَدَّثَنَا ابنُ أَبي شَيْبَة، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، عَنْ أَبِي الْأَشْهَبِ، عَنْ أَبِي الْحَكَمِ الْبُنَانِيِّ، عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **إِنَّ مِمَّا أَخْشَى عَلَيْكُمْ بَعْدِي بُطُونَكُمْ، وَفُرُوجَكُمْ، وَمُضِلَّاتِ الْأَهْوَاءِ** ».

كتاب السنة لابن أبي عاصم | ١٤

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ئیستقامەتان هەبێ و دەس بگرن بە شوێنکەوتنی سەلەف، ئاگادار و وریا بن لە بیدعە و داهێنان.

حدثنا محمد بن يحيى، أنبأنا أبو حذيفة، حدثنا سفيان، عن ابن طاووس، عن أبيه، قال: قال ابن عباس رضي الله عنهما: عليكم بالاستقامة والاتباع، وإياكم والتَّبَدُّع.

كتاب السنة للمروزي | ٧١ كتاب البدع لابن وضاح | ٦١ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٢١٢ ذم الكلام وأهله للهروي | ٧٢٣

**عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه دەڵێ: کردەوەیەکی کەم لە سوننە، خێری زیاترە لە کردەوەیەکی زۆر لە بیدعە.

حدثنا أبو عيسى، قال: حدثنا يحيى بن جعفر، قال: حدثنا عبدالوهاب، قال: حدثنا سعيد، عن قتادة، قال: قال ابن مسعود رضي الله عنه: عملٌ قليلٌ في سُنَّةٍ، خيرٌ مِن عملٍ كثيرٍ في بدعة.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٢٥٦

**عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه دەڵێ: کەمێک لە سوننەت چاکتر و خێردارترە هەتا هەوڵدان و تێکۆشانێکی زۆر لە بیدعە.

حدثنا أبو بكر، حدثنا الفريابي، عن سفيان، عن الأعمش، عن مالک بن الحارث، عن عبدالرحمن بن يزيد، عن ابن مسعود رضي الله عنه، أنه قال: قَصد في سُنَّة خير مِن اجتهاد في بدعة.

كتاب السنة لحرب الكرماني ا ٥٩٠ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٢٥٧ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٤٣٧

ئەم ئەثەرە لای **إبن بطة** بەم لەفظە هاتووە: الإقتصاد في السُّنَّة خير مِن الإجتهاد في البدعة، وكُلُّ بدعةٍ ضلالة.

**عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه دەڵێ: ئاگادار بن لەو بیدعانەی خەڵکی دایدەهێنن، ئەم دینە لە دڵدا هەمووی پێکەوە دەرناچێ، بەڵکو شەیتان هەڵدەستێ بە دروستکردنی بیدعە لە دڵدا بەو جۆرە وردە وردە ئیمان لە دڵ دەردەچێ، وە کاتێ ئەوە نزیک بووەتەوە خەڵکی واز لەو فەرزانە بێنن کە مولزەمن پێوەی لە نوێژ، ڕۆژوو، حەڵاڵ و حەڕام، وە دەست بدەنە قسە کردن دەربارەی الله ﷻ، هەرکەس گەیشتە ئەو زەمانە ئەوە با ڕابکات، وتیان: ئەی باوکی عبدالرحمن بۆ کوێ ڕابکەین؟ وتی: بۆ هیچ شوێنێک، بە دڵ و دینی ڕابکات، لەگەڵ هیچ یەکێک لە ئەهلی بیدەع دانەنیشێ.

أخبرنا عبيدالله بن محمد بن أحمد، قال: أخبرنا علي بن محمد بن أحمد بن يزيد الرياحي، قال: حدثنا أبي، قال: حدثنا سعيد بن سعيد الخراساني، عن سفيان الثوري، عن مغيرة، عن إبراهيم، عن عبدالرحمن بن يزيد، قال: سمعت عبدالله بن مسعود رضي الله عنه، قال: إياكم وما يحدث الناس مِنَ البدع، فإن الدين لا يذهب مِنَ القلب بِمَرَّة، ولكن الشيطان يحدث له بدعًا حتى يخرج الإيمان مِن قلبه، ويوشك أن يَدع الناس ما ألزمهم من فرضه مِنَ الصلاة والصيام والحلال والحرام، ويتكلمون في ربهم عَزَّ وَجَلَّ، فمن أدرک ذالک الزمان فليهرب. قيل يا أبا عبدالرحمن، فإلى أين؟ قال: إلا لا أين، قال: يهرب بقلبه ودينه، لا يجالس أحدًا من أهل البدع.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ١٩٦ الحجة في بيان المحجة لقوام السنة ا ٢٢٤

**عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه دەڵێ: ئێمە شوێنکەوتەی ئەو دەلیلەین لە ڕەسول الله ـوە ﷺ پێمان گەیشتووە، شتێک داناهێنن لە نەفسی خۆمانەوە کە نەبووبێ و نابینە بیدعەچی، هەتا دەست بە ئاثارەوە بگرین گومڕا نابین.

أخبرنا محمد بن عمر بن حميد البزار، قال: أخبرنا عبدالله بن محمد بن أبي سعيد البزاز، حدثنا يوسف بن يعقوب، حدثنا محمد بن سابق، حدثنا أبو جعفر الرازي، عن العلاء بن المسيب، عن أبيه، قال: قال عبدالله: إنا نقتدي ولا نبتدي، ونتبع ولا نبتدع، ولن نَضِلَّ ما تمسكنا بالآثار.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ١٠٦

**أبي أمامه الباهلي** رضي الله عنه دەڵێ: هیچ کات شیرک نەبووە ئیللا سەرهەڵدان و سەرەتاکەی لە بەدرۆخستنەوەی قەدەرەوە سەرچاوەی گرتووە، وە هەر ئوممەتێک تووشی شیرک بووبێ، ئیللا سەرەتاکەی بەدرۆخستنەوەی قەدەر بووە، وە ئێوەش ئەی ئوممەتی ئیسلام تاقیدەکرێنەوە پێیان، ئەگەر پێیان گەیشتن ئەوە مەهێڵن دەسەڵاتیان هەبێ بەسەر مەسئەلەیەکدا و گوێیان بۆ مەگرن، چونکە توشی شوبهەتان دەکەن.

أخبرنا عبيدالله بن محمد، قال: حدثنا علي بن محمد بن يزيد، قال: حدثنا أبي، قال: حدثنا أبو عثمان الأزدي، قال: حدثنا سليمان التيمي، حدثني أبو عثمان النهدي، عن أبي أمامة الباهلي، قال: ما كان شِركُ قَطُّ، إلا كان بَدؤُه تكذيبًا بالقدر، ولا أشركت أُمة قَطُّ إلا بدوُّه: تكذيب بالقدر،

وإنكم ستبتلون بهم أيتها الأمة، فإن لقيتموهم فلا تُمَكِّنوهم من المسألة، فيدخلوا عليكم الشُّبهات.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٠٠

**عبدالله بن داود** دەڵێ: پرسیارم کرد لە سفیان الثوري دەربارەی کەلام، وتی: واز بێنە لە باتڵ، بەڵکو بزانە تۆ لە کوێی حەقی؟! شوێن سوننەت بکەوە، واز بێنە لە بیدعە.

وقال عبدالله بن داود الخُريبي: سألت سفيان الثوري عن الكلام، فقال: دَع الباطل أين أنت عَنِ الحق؟! اتبع السُّنة، ودَع البدعة.

الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٢٢٦

**أبو محمد المرتعش** دەڵێ: پرسیار کرا لە باوکی حفص: بیدعە چییە؟ وتی: سنوور بەزاندنی ئەحکامە، وە ئیهمال کردن و پشت گوێ خستنی سوننە ـیە، وە شوێنکەوتنی ڕەئی و هەوا و ئارەزووە، وە تەرک کردنی شوێنکەوتنی سەلەفە.

قال أبو محمد المرتعش: سُئل أبو حفص: ما البدعة؟ قال: التعدي في الأحكام، والتهاون بالسنن، واتباع الآراء والأهواء، وترك الاقتداء والاتباع.

الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٢٤١

**نعيم بن عريب** دەڵێ: عنبسة بن سعيد وتی: هیچ کەسێک نییە بیدعەیەک دابهێنێ، ئیللا دڵی ڕق و حقد دەگرێ بەرامبەر بە موسڵمانان، وە ئەمانەت لە دڵی دەردەچێ. نعیم دەڵێ: الأوزاعي ئەمەی لێ بیستم، وتی: تۆ ئەمەت لە عنبسة بیستووە؟ وتم: بەڵێ. وتی: ڕاستی وتووە، ئێمە قسەمان دەکرد دەمانوت: هیچ کەسێک نییە بیدعەیەک دابهێنێ ئیللا وەرعی لێ دادەڕنێ و نامێنێ.

أخبرنا محمد بن موسى، حدثنا الأصَم، حدثنا الصاغاني، حدثنا أحمد بن أبي الطَّيب، حدثنا بَقيَة، حدثنا نُعَيم بن عَريب، حدثني عَنبسة بن سعيد الكَلاعي، قال: ما ابتدعَ رَجُل بدعة، إلا غَلَّ صدره على المسلمين، واختُلجَت مِنه الأمانة. قال نُعَيم: فسمعه مِني الأوزاعي، فقال: أنتَ سمعته مِن عَنبسة؟ قلت: نعم، قال: صَدَقَ، لقد كُنا نتحدث: أنه ما ابتدع رَجُل بِدعة إلا سُلِبَ وَرَعه.

ذم الكلام وأهله للهروي | ٩٣٣ الشرح والإبانة لابن بطة | ١٠٣

**أبو عمرو الأوزاعي** دەڵێ: هەرکەسێک ڕێز لە خاوەن بیدعە بگرێ و بە گەورە سەیری بکات، ئەوە یارمەتیدەر بووە لە ئیختلاف و دابەش بوونی ئیسلام.

وأخبرني غالب بن علي بن محمد بن إبراهيم بن غالب، أخبرنا علي بن عمر بن محمد الصيرفي، حدثنا أبو حمزة أحمد بن عبدالله بن عمران المروزي، قال: سمعت علي بن خشرم، يقول: سمعت عيسى بن يونس، يقول: سمعت الأوزاعي، يقول: مَن وَقَرَ صاحب بدعة، فقد أعانَ على فُرقة الإسلام.

ذم الكلام وأهله للهروي | ٩٣٦

**إبراهيم بن ميسرة** دەڵێ: هەرکەسێک ڕێز لە خاوەن بیدعە بگرێ و بە گەورە سەیری بکات، ئەوە یارمەتیدەر بووە لە ڕووخاندنی ئیسلام.

أخبرنا محمد بن عبدالرحمن بن جعفر، قال: حدثنا سعيد بن محمد الخياط، قال: حدثنا إسحاق بن إبراهيم، قال: حدثنا حسان بن إبراهيم

الكرماني، قال: حدثنا محمد بن مسلم: عن إبراهيم بن ميسرة، قال: ومَن وَقَّرَ صاحب بدعة، فقد أعانَ على هدم الإسلام.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٧٣ ذم الكلام وأهله للهروي | ٩٤١

**مجاهد** لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ ﴾ دەڵێ: مەبەست لێی بیدعە و شوبهاتە.

حدثني محمد بن عمرو، قال: حدثنا أبو عاصم، قال: حدثنا عيسى، عن ابن أبي نجيح، عن مجاهد، في قول الله ﷻ: ﴿ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ﴾. قال: البدع والشهوات.

تفسير الطبري | **(٤١٦/٨)** تفسير ابن أبي حاتم | **(١١٥٢/٦)** تفسير مجاهد | ٤١٧

ئەم ئەثەرە لای **مجاهد** بەم لەفظە هاتووە: البِدَع والشُبُهات والضلالات.

**سلام بن أبي مطيع** دەڵێ: أيوب السختياني پیاوێکی بینی لە بیدعەچییەکان ئەهلی هەوا و ئارەزوو، ووتی: من زەلیلی لە ڕوومەتیدا

دەبینم، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ اتَّخَذُوا الْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُفْتَرِينَ ﴾. پاشان وتی: ئەم ئایەتە بۆ هەموو موفتەرییەکە بوختان چییەکە.

أخبرنا عيسى بن علي، قال: أخبرنا عبدالله بن محمد البغوي، قال: حدثنا زياد بن أيوب، قال: حدثنا سعيد بن عامر، عن سلام بن أبي مطيع، قال: رأى أيوب رجلًا مِن أهل الأهواء، فقال: إني أعرف الذِّلَّة في وجهه، ثم قرأ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ اتَّخَذُوا الْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُفْتَرِينَ ﴾. ثم قال: هذه لكل مُفترَ.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٨٩

بیدعە ڕەئسی هەموو شەڕ و گومڕاییەکە، هەرکەسێک تووشی بیدعە بوو دڵی ئاوی خواردەوە پێی، وە تێکەڵاوی ئەهلی بیدەعی کرد، ئەوە زۆر بە ئاسانی دەبێتە خاوەنی ئەو مەنهەجەی کە تاوانی کەبیرە بە لایانەوە کوفرە، وە بە تێپەڕبوونی کات دەبێتە خاوەن عەقیدە و مەزهەبی خەوارج.

أبو قلابة دەڵێ: هیچ کەسێک نییە بیدعەیەک دابهێنێ ئیللا شمشێر و هەڵگرتنی چەک دژی ولاتی ئموری موسڵمانان بە حەڵاڵ دەزانێ.

أخبرنا مسلم بن إبراهيم، حدثنا وُهَيب، حدثنا أيوب، عن أبي قِلَابَة، قَال: مَا ابتَدَعَ رَجُلٌ بدعَةً إلَّا استَحَلَّ السَّيفَ .

سنن الدارمي ا ١٠٠ كتاب القدر للفريابي ا ٣٦٨ كتاب الشريعة للآجري ا ١٣٨

وتم: لە ئێستادا نمونەی لەم جۆرە لە واقعدا زۆرە، چەندین کەسمان دیوە سەرەتا عەقیدەی صحیح بووە، پاشان موعجیب بوون بە هەندێک ئەشخاص و شیوخی گومڕا هەتا حوبی ئەوان چوویە دڵیانەوە شوێن قەولەکانیان کەوتن و دینداریان بە هەمان مەزهەبی ئەوانەوە دەکرد، وردە وردە بوونە هەڵگری عەقیدەی خەوارج بە جۆرێک مامەڵەی کڕین و فرۆشتن بە دیاریکراوی کڕین لەگەڵ کافرێکی عامی بەلایانەوە کوفری ئەکبەرە و خاوەنەکەی لە دین پێی دەردەچێ! لەم جۆرە کەسانە لە تەبەقەی پێشکەوتوو ئەوەی پێی دەوترێ شیوخ و مەلا هەیە و دیومە، هێندە نەرم بووە لەگەڵ ئەهلی بیدەع بە هەموو جۆرێکیانەوە تێکەڵی و

سەردانی هەبووە لەگەڵیان هەتا عاقیبەتی لەو جۆرە عەقیدەوە دەرچووە، هەروەها لە تەبەقەی وەسەط و موبتەدیئین هێندە زۆرن لە ژماردن نایەن.

ئەنجا پێم باشە ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ بدەم هەتا خەڵکانێک بە هەڵە تێنەگەن، ئێمە کاتێک باسی ئەم ئەثەرە دەکەین و موعامەلەی لەگەڵ دەکەین خەیاڵیان بۆ ئەوە نەچێ هەرکەسێک بچێتە سەر کورسی فەرمانڕەوایی بەلامانەوە وەلی ئەمری ئیمانداران بێ! وە ئەم ئەثەرە تەنزیل ناکەینە سەر هەر حاکمێک کە لە ڕووی شەرعەوە وەلی نەبێ هەتا دڵ نەخۆشەکان بەمە دڵیان خۆش نەبێ و بچن تۆمەتبارمان بکەن بە مورجیئە! بەڵکو کاتێک دەڵێین دەرچوون لە وەلی ئەمر، بە مانای کەلیمە مەبەستمان وەلی ئەمرێکە بە پێی دەقی شەرعی قورئان و حدیث وەلی ئەمری موسڵمانان بێ واتە شەخصەکە موسڵمان بێ، ناچین بە شێوەی مەزهەبی مورجیئە تەنزیلی بکەین، بەڵکو بەو فەهمە لێی تێدەگەین و دایدەبەزێنین کە سەلەف مامەڵەیان لەگەڵ کردووە، بەو جۆرە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەین کە أبو قلابة وتوویەتی و هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردووە.

أبو قلابة عبدالله بن زيد بن عمرو الجرمي البصري، گەورە تابعییە ساڵی «١٠٤» هیجری وەفاتی کردووە، قیممەی بەهێزی خیلافەتی ئومەوییەکانی بینیوە، وە لە زەمەنی سەرهەڵدانی گرووپە گومڕاکان ژیاوە کاتێک ئەم قسەیەی کردووە حاڵی ئەو گرووپانەی دیوە، وە ئەو کەسانەشی بینیوە بە هۆی بیدعەوە چۆن تێوەگلاون لە دەرچوون و شمشێر هەڵگرتن دژی وڵاتی ئموری موسڵمانان، جا ئەوکاتە هەرچی خەلیفە هەبووە موسڵمان بوون بە قورئان و حدیث حوکمیان کردووە، بۆیە أبو قلابة تەنزیلی کردووەتە سەر حاکمی موسڵمان، وە ئێمەش کاتێک ئەم قەولە دەهێنین مەبەستمان وەلی ئەمری موسڵمانە نەک هەر کافرێک بچێتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی بە وەلی بزانین.

سلام بن أبي مطيع دەڵێ: أيوب السختياني پیاوێکی بینی لە ئەهلی هەوا و ئارەزوو، ووتی: من زەلیلی لە ڕوومەتیدا دەبینم، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ اتَّخَذُوا الْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُفْتَرِينَ ﴾. پاشان وتی: ئەم ئایەتە بۆ هەموو موفتەرییەکە بوختان چییەکە کە دینێکی نوێی داهێنابێ، أيوب بە ئەهلی هەوا و ئارەزووی دەوت خەوارج، وە دەیوت: خەوارج

لە ناودا ئیختلافیان هەیە، بەڵام لە هەڵگرتنی شمێردا هەموویان یەک دەنگن و کۆبوونەتەوە.

حدثنا زياد بن أيوب، حدثنا سعيد بن عامر، عن سلام بن أبي مطيع، قال: رأى أيوب رجلًا مِن أصحاب الأهواء، فقال: إني لأعرف الذلة في وجهه، ثم قرأ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ اتَّخَذُوا الْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُفْتَرِينَ ﴾. ثم قال: هذا لكل مُفترٍ، فكان أيوب يُسمى أصحاب الأهواء خوارج، ويقول: إنَّ الخوارج اختلفوا في الاسم، واجتمعوا على السيف.

مسند ابن الجعد | ١٢٣٦ كتاب القدر للفريابي | ٣٧٥

**عبدالرحمن بن مهدي** دەڵێ: بیستم مالک بن أنس دەیوت: ئەم گرووپە گومڕایانە هیچکامیان لە سەردەمی ڕەسول الله ﷺ، وە لە سەردەمی أبو بکر و عمر و عثمان رضی الله عنهم بوونیان نەبوو، وە مالک ئەو کەسانەی دژی عثمان رضي الله عنه دەرچوون بە خەوارج ناو دەهێنان.

حدثني يعقوب بن إبراهيم، حدثنا عبدالرحمن بن مهدي، قال: سمعت مالک بن أنس، يقول: لم يكن شيءٌ مِن هذه الأهواء على عهد رسول الله

ﷺ، ولا أبي بكر، ولا عمر، ولا عثمان، وكان مالك يُسمى الذين خَرجوا على عثمان: خوارج.

كتاب القدر للفريابي | ٣٨٧ ذم الكلام وأهله للهروي | ٨٧٨

**أبي العالية الرياحي** دەڵێ: دوای وەفاتی ڕەسول الله ﷺ بە دە ساڵ قورئانم خوێند و حفظم كرد، وە الله ﷻ دوو نیعمەتی ڕژاندووەتە سەرم نازانم کامیان لەویتریان چاكترە: هیدایەتی دام بۆ دینی ئیسلام، وە نەیكردمە خەوارج.

حدثنا أبو بكر ابن أبي شيبة، حدثنا يزيد بن هارون، حدثنا هَمام، عن قتادة، عن أبي العالية، قال: قرأت القرآن بعد وفاة نبيكم ﷺ بعشر سنين، وقد أنعم عَلَيَّ بنعمتين، ما أدري أيُّهما أفضل: أن هَداني للإسلام، أو لم يجعلني حَروريًا.

كتاب القدر للفريابي | ٣٩٣ كتاب أصول السنة لابن أبي زمنين | ٢٤٧
شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٣٠

حەروری یەكێكە لە ناوەكانی خەوارج، بۆیە ئەو ناوەیان لێنراوە، لەبەرئەوەی كاتێک صوڵح كرا لە نێوان ئیمامی علي و ئیمامی معاوية رضي

الله عنهما، ئەوانەی لە ئیمامی علي دەرچوون و ڕازی نەبوون پێی ڕوویان کردە ناوچەیەک پێی دەوترا: حروراء. لادێیەکە لە کوفە.

ئەم ئەثەرە لای **إبن أبي زمنين** بەم لەفظە هاتووە: ما أدري أيُّ النعمتين أعظم عَلَيَّ: نعمة أنعمها عَلَيَّ فأنقذني بها مِن الشِّرك، أو نعمته أنعمها عَلَيَّ فأنقذني بها مِن الحَرورية.

وە لای **اللالكائي** بەم لەفظە هاتووە: ما أدري أي النعمتين عليَّ أعظم: إذ أخرجني الله مِنَ الشِرک إلى الإسلام، أو عصمني في الإسلام أن يكون لي فيه هوى.

**عبدة بن سليمان** دەڵێ: پرسیار کرا لە عبدالله بن مبارک دەربارەی تەفسیری ئەم حدیثە: « خەڵکی بەردەوام لەسەر خێرن هەتا ئەوکاتەی عیلم لە گەورەکانیانەوە وەربگرن، هەرکات لە بچووکەکانیانەوە وەریبگرن ئەوکات تیا دەچن؟ ». واتاکەی چییە؟ وتی: مەبەست لێی ئەهلی بیدەعە، ئەمما بچووک عیلم بگەیێنێ بە کەسانی گەورە، ئەوە بچووک نییە، بەڵکو گەورەیە.

أخبرنا أحمد بن محمد بن منصور بن الحسين الخطيب، أخبرنا أحمد بن محمد بن روزنة الفارسي بهمذان، حدثنا علي بن محمد بن عامر النهاوندي، حدثنا يوسف بن يونس الجرجاني -بِعَكّة- حدثنا يحيى بن بكير بن يونس، حدثنا عبدة بن سليمان، قال: سئل عبدالله بن المبارك عن تفسير هذا الحديث، قال: «لا يزال الناس بخير ما أخذوا العلم عن أكابرهم، فإذا أخذوا عن أصاغرهم هلكوا». ما معناه؟ قال: هم أهل البدع، فأما الصغير يؤدي إلى كبيرهم، فهو كبير.

ذم الكلام وأهله للهروي ١٤١١

هەروەها **نعيم بن حماد** دەڵێ: پرسیار کرا لە عبدالله بن مبارک: الأصاغر کێن؟ وتی: ئەو کەسانەن بە ڕەئی فەتوا دەدەن و قسە دەکەن، ئەمما کەسی بچووک لە گەورەوە ڕیوایەت بکات ئەوە بە بچووک دانانرێ.

وە **أبو عبيد قاسم بن سلام** لە تەفسیری ئەم حدیثەدا دەڵێ: عبدالله بن مبارک بۆ ئەوە دەچێ الأصاغر ئەهلی بیدەعن نەوەک مەبەستی ساڵ و تەمەن بێ.

قال نعيم: قيل لابن المبارک: مَنِ الأصاغر؟ قال: الذين يقولون برأيهم، فأمَّا الصغير يروي عن كبير فليس بصغير.

وذكر أبو عبيد في تأويل هذا الخبر عن ابن المباک أنه كان يذهب بالأصاغر إلى أهل البدع ولا يذهب إلى السِّن.

جامع بيان العلم لابن عبدالبر ا ١٠٥٢

**موسى بن أيوب** دەڵێ: عبدالله بن مبارک دەڵێ: مەبەست لە الأصاغر ئەهلی بیدەعە.

قال موسى بن أيوب النصيبي: قال ابن المبارک: الأصاغر مِن أهل البدع.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ١٠٢

**إبراهيم الحربي** لە تەفسیری قەولی: « خەڵکی بەردەوام لە خێردان هەتا عیلم لە گەورەکانیانەوە وەربگرن ». دەڵێ: واتە ئەگەر بچووک دەست بگرێ بە قەولی ڕەسول الله ﷺ، صەحابە و تابعین ئەوە گەورەیە و بە گەورە حسێب دەکرێ، وە کەسی گەورە و بە تەمەن سوننە تەرک بکات و دەست بگرێ بە قەولی أبو حنيفه ـوە ئەوە بچووکە و بە بچووک دادەنرێ.

أخبرنا عبيدالله بن محمد بن أحمد، حدثنا أحمد بن محمد بن الصباح الهروي، قال: سمعت أبا حامد، قال: سمعت إبراهيم الحربي، يقول في قوله: «لا يزالون بخير ما أتاهم العلم مِن قِبَل كبرائهم». معناه: أنَّ الصغير إذا أخذ بقول رسول الله ﷺ والصحابة والتابعين فهو كبير، والشيخ الكبير إن أخذ بقول أبي حنيفة وترك السنن فهو صغير.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ١٠٣

**طاووس بن كيسان** دەڵێ: پیاوێک بە عبدالله بن عباس رضي الله عنهما وت: الحمدلله کە هەوا و ئارەزووی ئێمەی سەرخستووە و داناوە بەسەر هەوا و ئارەزووی ئێوەدا. إبن عباس پێی وت: هەموو هەوا و ئارەزوویەک گومڕاییە.

حدثنا عمر بن أيوب، قال: حدثنا محفوظ، قال: حدثنا إبراهيم بن خالد الصنعاني، قال: حدثنا رباح بن زيد، عن معمر، عن ابن طاووس، عن أبيه، أنَّ رَجلُ قال لابن عباس: الحمدلله الذي جعل هَوانا على هَواكم. فقال: كُل هَوى ضَلالة.

كتاب الشريعة للآجري ا ١٢٦ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٢٤٩ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٢٥

مەبەست لە الأهواء هەموو گرووپە گومڕاکان دەگرێتەوە، وەک: « ڕافیزە، خەوارج، مورجیئە، قەدەرییە، موعتەزیلە، جەهمییە » بە هەموو لقەکانیانەوە عەقیدەیان پێچەوانەی عەقیدەی ئەهلی سوننەیە، هەندێکیان بیدعەکانیان کوفرییە، وە هەندێکیان بیدعەکانیان کوفری نییە، جا هەرکات وترا أهل الأهواء واتە ئەهلی بیدەع و گومڕاکان.

**طاووس** دەڵێ: الله ﷻ لە قورئاندا لە هەر شوێنێک باسی هەوا و ئارەزووی کردبێ ئیللا بە خراپە و عەیبدار باسی کردووە.

أخبرنا الحسن، قال: أخبرنا أحمد بن الحسن، قال: حدثنا بِشر، قال: حدثنا معاوية، قال: حدثنا أبو إسحاق، عن ابن عيينة، عن سليمان الأحول، عن طاووس، قال: ما ذَكَرَ الله هَوى في القرآن إلا عَابَه.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٢٨ ذم الكلام وأهله للهروي | ٤٧١ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي | ٢٧٧

ئەم ئەثەرە لای **الهروي** و **أبي الفتح** لە جیاتی کەلیمەی « عَابَه » کەلیمەی « ذَمَه » هاتووە.

**سلمان الفارسي** رضي الله عنه دەڵێ: ئەگەر پیاوێک سەری لەسەر بەردە ڕەشەکەی کعبە بێ، وە بە ڕۆژ بەڕۆژوو بێ بە شەویش شەو نوێژ بکات، الله ﷻ لە ئاخیرەتدا زیندووی دەکاتەوە لەگەڵ ئەو هەوا و ئارەزووەی تیایدا بووە.

أخبرنا محمد بن حُمَيد، عن هارون -هوَ ابن المُغيرة- عن شُعَيب، عن سَلَمة بن كُهَيل، عن أَبي صَادِقٍ، قال: قال سلمان رضي الله عنه: لَو وَضَعَ رَجُلٌ رَأسَه عَلى الحَجَرِ الْأَسوَد، فَصَامَ النَهارَ وَقَامَ اللَّيلَ، لَبَعَثَهُ اللَّهُ يَومَ القِيَامَةِ مَعَ هَوَاه.

سنن الدارمي | ٣٢٠

**عامر بن شراحيل الشعبي** دەڵێ: ئەهلی هەوا و ئارەزوو بۆیە ئەو ناوەیان لێنراوە، چونکە خاوەنەکانیان دەبەن و شۆڕ دەکەنەوە بۆ ناو ئاگر.

حدثني أَبي، حدثنا وكيع، عن شَريكٍ، عن أَبي عبدالرحمن المرادي، عن الشَّعبِي، قال: إنما سُمُّوا أَصحاب الأَهواء، لأَنهم يَهوُون في النار.

كتاب السنة لعبدالله | ٦٦٥ سنن الدارمي | ٤١٤ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٢٩ الحجة على تارک المحجة لأبي الفتح المقدسي | ٣١٢

ئەم ئەثەرە لای **اللالكائي** بەم لەفظە هاتووە: إنما سُميَت أهل الأهواء: أهل الأهواء، لأنهم يَهوُون في النار.

وە لای **أبي الفتح المقدسي** بەم لەفظە هاتووە: إنما سُميت الأهواء، لأنها تهوي بصاحبها في النار، ألا ترى في القرآن أنَّه ليس مِن هوى جرَّ إلى خير.

**عبدالله بن عون** دەڵێ: محمد بن سيرين وای دەبینی خێراترین کەسانێک تووشی ڕیدە دەبن ئەهلی هەوا و ئارەزوون.

حدثنا عبيدالله بن معاذ، حدثنا أبي، حدثنا ابن عَون، قال: كان محمد يرى أنَّ أسرعَ الناس رِدَةً: أهل الأهواء.

كتاب القدر للفريابي | ٣٦٢ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٧٧ الحجة على تارک المحجة لأبي الفتح المقدسي | ٣٠٣

**أبو قلابة** دەڵێ: ئەهلی هەوا و ئارەروو ئەهلی گومڕایین، ڕێگا و چارەنوسیان بەجۆرێک دەبینم بەرەو ئاگر دەچن.

حدثنا قتيبة، حدثنا حماد بن زيد، عن أيوب، عن أبي قلابة، أنه كان يقول: إنَّ أهل الأهواء، أهل الضلالة، ولا أرى مصيرهم إلى إلى النار.

كتاب القدر للفريابي ا ٣٦٦ كتاب الشريعة للآجري ا ١٣٦

**إبراهيم النخعي** دەڵێ: ئەگەر ئینسان بەهێز بوو ڕێگەی نەدا شەیتان بگاتە لای زەفەری پێ بێنێت، دەڵێ: لە کوێوە بۆی بچم؟ پاشان دەڵێ: لە ڕێگەی هەواو ئارەزووەوە بۆی دەچم.

أخبرنا علي بن محمد بن أحمد بن بكران، قال: حدثنا الحسن بن محمد بن عثمان، قال: حدثنا يعقوب بن سفيان، قال: حدثنا الحُميدي، قال: حدثنا فضيل بن عياض، عن منصور، عن إبراهيم، قال: إذا امتنع الإنسان مِن الشيطان، قال: مِن أين آتيه؟ قال: ثم يقول: بلى، آتيه مِن قِبَلِ الأهواء.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٣٢ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٣٠١

**الأوزاعي** دەڵێ: شەیتان بە هاوەڵ و ئەولیاکانی دەڵێ: لە چ ڕێگەیەکەوە دەچن بۆ بەنی آدم؟ ئەوانیش دەڵێن: لە هەموو ڕێگایەکەوە، دەڵێ: دەتوانن لە ڕێگەی إستغفارەوە بۆیان بچن؟ دەڵێن: هیهات، ناتوانین لەو ڕێگەیەوە، چونکە إستغفار بەستراوەتەوە بە تەوحیدەوە، دەڵێ: شتێک لە ناویاندا بڵاودەکەمەوە داوای تەوبە و إستغفاری لێ نەکەن، بیدعە و هەوا و ئارەزووی تیایاندا بڵاوکردەوە.

أخبرنا إبراهيم بن إسحاق، عن ابن المبارك، عن الأوزاعي، قال: قال إبليس لأوليائه: مِن أي شيء تأتون بني آدم؟ فقالوا: مِن كُل شيء، قال: فهل تأتونهم مِن قبل الاستغفار؟ قالوا: هيهات، ذاك قُرِنَ بالتوحيد، فقال: لأَبُثَنَّ فيهم شيئًا لا يستغفرون الله منه، قال: فَبَثَ فيهم الأهواء.

سنن الدارمي ا ٣١٧ الشرح والإبانة لابن بطة ا ١٠١ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٣٦ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٩٥٥

**عاصم بن سليمان الأحول** دەڵێ: أبو العالية دەڵێ: وریا و ئاگاداری ئەو هەوا و بیدعانە بن کە دوژمنایەتی و ڕق و کینە لە نێوان خەڵکیدا دەنێتەوە. ئەمەم بۆ حسن البصري گێڕایەوە، ئەویش وتی: ڕاستی وتووە و ئامۆژگاری کردوون، بۆ حفصة بنت سيرين ــم گێڕایەوە، وتی: ئەی باهلي،

ئەمەت بۆ محمد بن سيرين گێڕاوەتەوە؟ وتم: نەخێر، وتی: کەواتە بڕۆ بۆی بگێڕەوە.

أخبرنا أحمد بن عبيد، قال: أخبرنا محمد بن الحسن، قال: حدثنا أحمد بن زهير، قال: حدثنا سليمان بن حرب، قال: حدثنا حماد بن زيد، عن عاصم، قال: قال أبو العالية: إياكم وهذه الأهواء التي تُلقى بين الناس العداوة والبغضاء. فحدثت الحسن، فقال: صَدَقَ ونَصَحَ، فحدثت به حفصة بنت سيرين، فقالت: يا باهِليُّ، أنت حدثت بهذا محمدًا؟ قلت: لا، قالت: فحدثه إذًا.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢١٤

**مطرف بن عبدالله** دەڵێ: ئەگەر ئەهلی بیدەع هەموو لەسەر یەک ڕێچکە و یەک گرووپ بوونایە، ئەوە دەوترا: لەوانەیە لەسەر حەق بن، بەڵام کاتێک دەبینی ئیختلافیان هەیە و جیاوازن لە ناو خۆیاندا، ئەوە هەموو خاوەن عەقڵێک دەزانێ کە حەق تەفرەقە و دابەش بوون نییە.

وعن مُطرِّف بن عبدالله الشِّخير: لو كانت هذه الأهواء هوى واحدًا، لقال قائل: لَعَلَّ الحق فيه، فلما تشعبت فاختلفت، عرف كل ذي عقل أَنَّ الحقَّ لا يتفرق.

الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٢٩٦

**عبدالرحمن بن عمر** دەڵێ: لای عبدالرحمن بن مهدي باسی کەسانێک لە ئەهلی بیدەع کرا، خاوەنی عیبادەتی زۆرن و تێدەکۆشن لە عیبادەتدا، وتی: الله ﷻ عەمەلێک وەرناگرێ کە موافقی کتاب و سوننە نەبێ. پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ ﴾. ڕەهبانیەتی لێوەرنەگرتن، هەروەها هەڕەشەی لێکردن، دواتر وتی: پابەندی ڕێگای حەق و سوننە بە.

حدثنا أحمد بن إسحاق، حدثنا عبدالرحمن بن محمد، حدثنا عبدلرحمن بن عمر، قال: ذُكِرَ عند عبدالرحمن بن مهدي قومٌ مِن أهل البدع، واجتهادهم في العبادة، فقال: لا يَقبلُ الله إلا ما كان على الأمرِ والسنة. ثم قرأ: ﴿ وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ ﴾. فلم يَقبَل ذالک منهم، وَوَبَخَهُم عليه، ثم قال: الزم الطريق والسُّنة.

حلية الأولياء لأبي نعيم ا ١٢٩٠٢

**سفيان الثوري** دەڵێ: بیدعە لای شەیتان خۆشەویست ترە هەتا تاوان و سەرپێچی کردن، چونکە خاوەن سەرپێچی تەوبەی لێدەکات، وە الله

ﷻ لە سەرپێچی کار خۆش دەبێ، ئەمما موبتەدع ئەوە تەوبەی لێناکات، وە الله ﷻ لە بیدعە خۆش نابێ.

وسمعت يحيى بن يمان، يقول: سمعت سفيان الثوري، يقول: البدعة أَحَبُّ إلى إبليس مِنَ المعصية، والمعصية يُتاب منها، والبدعة لا يُتاب منها.

مسند ابن الجعد | ١٨٠٩ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٣٨ ذم الكلام وأهله للهروي | ٩٢٨

لەوانەیە کەسێک بپرسێ هۆکار چییە و بۆچی وتوویانە الله ﷻ لە بیدعە خۆش نابێ لەکاتێکدا لە مەعصیە خۆش دەبێ؟ دەڵێم: ئەو کەسەی بیدعەیەک ئەنجام دەدات دوای ڕوونکردنەوەش بۆی کە ئەمەی دەستت داوەتێ بیدعەیە دەبێ وازی لێبهێنێ، بەڵام ئەو ملکەچ نابێ و هەر بەردەوام دەبێ لەسەر بیدعەکەی، وە بە حەقی دەزانێت و دەبینێ بە جۆرێک پێی وایە ئەوەی ئەم لەسەریەتی دینی حەقە، وە ئەوەی موخالفینی ئەم لەسەرینی باتڵە، وە پێی وایە دەبێ ئەوانیش شوێن ئەوە بکەون ئەم هێناویەتی و لەسەریەتی، لەم حاڵەتەدا ئەو بیدعەیە بووەتە دین بە لای شەخصەکەوە تەرک کردن و وازهێنان لێی بە تاوان و تەرک کردنی واجب دەبینێ، وە مولتەزیم بوون پێوەی بە دین و جێبەجێکرنی

واجب تەماشا دەكات و چاوەڕێی پاداشتە لێی، لەم حاڵەتەدایە سەلەف وتوویانە بیدعە لێخۆشبوونی نییە، هەروەها پێیان وایە تەوبەی موبتەدع بۆیە هێندە قورسە، چونكە تاوانەكەی تایبەت نییە بە خۆیەوە، بەڵكو پەیوەندی بە غیری خۆیشیەوە هەیە، دەكرێ چەندین كەس ئیعتقاد بەو قەول و مەزهەبەی ئەم موبتەدعە بكەن و واز نەهێنن لەو ئیعتقادە تەنانەت دوای تەوبەكردنی خاوەنەكەی.

ئەم قەولە « خاوەنی بیدعە تەوبەی بۆ نییە ». بە مەرفوعی لە ڕەسول اللە ـەوە ﷺ لە چەند ڕێگەیەكەوە هاتووە، بەڵام ضەعیفە، هەموو ڕێگاكانی ڕیوایەت كردنی سەنەدەكانیان كەسانی ضەعیفی تێدایە.

حدثنا ابن مُصَفَّى، حدثنا بَقِيَّةُ، حدثنا محمد بن عبدالرحمن، حدثني حُمَيد، عن أَنَسٍ رضي الله عنه، قال رسول الله ﷺ: « **إِنَّ اللهَ حَجَزَ -أَو قَالَ: حَجَبَ- التَّوبَةَ عَنْ كُلِّ صَاحِبِ بِدْعَةٍ** ».

كتاب السنة لابن أبي عاصم ا ٣٧ كتاب البدع لابن وضاح ا ١٥٧

**إبن وضاح** بەم سەنەدە هێناویەتی: حدثنا أَسَدُ، حدثنا عبدالله بن خَالِد، عن بَقِيَّةُ... سەنەدی هەردوو ڕیوایەتەكە دەچێتەوە سەر بقية بن وليد

ئەویش لە محمد بن عبدالرحمن ڕیوایەتی کردووە، « محمد بن عبدالرحمن القشيري الكوفي » کەسێکی ضەعیف و مەتروکە.

حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مَنْصُورٍ الْحَنَّاطُ، عَنْ أَبِي زَيْدٍ، عَنْ أَبِي الْمُغِيرَةِ، عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «**أَبَى اللَّهُ أَنْ يَقْبَلَ عَمَلَ صَاحِبِ بِدْعَةٍ حَتَّى يَدَعَ بِدْعَتَهُ**».

سنن ابن ماجه | ٥٠ كتاب السنة لابن أبي عاصم | ٣٩

**إبن أبي عاصم** بەم سەنەدە هێناویەتی: حدثنا الحسن بن علي، حدثنا عبدالله بن سعيد... هەردوو ڕیوایەتەکە لە عبدالله بن سعيد الأشج دەرچووە، ئەم ڕیوایەتەش ضەعیفە، چونکە هەریەک لە « بشر بن منصور، أبو زيد، أبو المغيره » مەجهولن.

ئەم حدیثە بێجگە لەو ڕێگایانە لە هەر ڕێگایەکی ترەوە هاتبێ خاڵی نییە لە ضوعف و عیللاتی ضوعف، بەڵام لە قەولی سەلەف، وەک: « حسن البصري، فضيل بن عياض، عطاء الخراساني » سابت بووە.

**حسن البصري** دەڵێ: خاوەنی بیدعە، الله ﷻ نوێژ، ڕۆژوو، حەج، عەمرە، جیهاد، فەرز، سوننەت ـی لێ قبوڵ ناکات.

حدثنا إبراهيم بن عثمان المصيصي، حدثنا مخلد بن حسين، عن هشام، عن الحسن، قال: صاحب البدعة لا يقبل الله له صلاةً، ولا صيامُ، ولا حَجُ، ولا عُمرةُ، ولا جهادُ، ولا صَرفُ، ولا عَدلُ.

كتاب القدر للفريابي ا ٣٧٦ كتاب الشريعة للآجري ا ١٣٧ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٧٠

**حسن البصري** دەڵێ: الله ﷻ هیچ عەمەلێک لە خاوەن بیدعە قبوڵ ناکات.

أخبرنا علي بن محمد بن أحمد، قال: أخبرنا الحسن بن عثمان، قال: حدثنا يعقوب، قال: حدثنا أبو عاصم، عن هشام، عن الحسن، قال: لا يقبل الله مِن صاحِبِ البدعة شيئًا.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٧١

**حسن البصري** دەڵێ: الله ﷻ ڕازی نابێ بە تەوبەی خاوەن هەوا و ئارەزوو.

أخبرنا علي بن محمد بن أحمد بن بَكران، أخبرنا الحسن بن محمد بن عثمان، قال: حدثنا يعقوب، قال: حدثنا أبو صالح، قال: حدثني معاوية بن صالح، أنَّ الحسن بن أبي الحسن، قال: أَبَى الله تبارک وتعالى أن يأذن لصاحب هَوى بتَوبة.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٨٥

**فضيل بن عياض** دەڵێ: خاوەن بیدعە هیچ عەمەلێکی بەرز نابێتەوە بۆ لای الله ﷻ.

وأخبرنا الحسن بن عثمان، قال: أخبرنا أحمد بن حمدان، قال: حدثنا أحمد بن الحسن، قال: حدثنا عبدالصمد، قال: سمعت الفضيل بن عياض، يقول: لا يرفع لصاحب بدعةٍ إلى الله عمل.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٧٢

**عطاء الخراساني** دەڵێ: پێم وانییە و بە نزیکی نابینم کە الله ﷻ تەوبەی خاوەن بیدعە قبوڵ بکات.

أخبرنا محمد بن عبدالرحمن بن جعفر، قال: حدثنا سعيد بن محمد، قال: حدثنا إسحاق بن إسرائيل، قال: حدثنا عبدالله بن المبارک، عن

الأوزاعي، عن عطاء الخراساني، قال: ما يَكادُ الله أن يأذن لصاحب بدعةَ بتَوبَة.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٨٣ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٧٩٤

جا لێرەدا پێویستە ئاماژە خاڵێکی گرنگ بکەین دەربارەی قورسی تاوانی ئەهلی بیدەع، ئەویش ئەوەیە سەیری سەلەف بکەن ئەو حدیثەی باسی خەوارج دەکات و هەڕەشە و زەجرە بۆیان لە ژێر بابی ئەهلی بیدەع هێناویانە، وە تەنزیلیان کردووەتە سەر هەندێک لە ئەهلی بیدەع و ڕئوسی ئەهلی بیدەع، وەک: عمرو بن عبید موعتەزیلی، ئەمە بە مانای ئەوە دێ ئەهلی بیدەع کاتێک دینداری بە بیدعەکەیان دەکەن و بە دینی حەقی دەزانن و موناقەشە و جیدال و مونازەڕەی لەسەر دەکەن، زۆر بە ئەستەم دەگەڕێنەوە و تەوبەی لێدەکەن، وتوویانە هەرکات تیر لە کەوان دەرچوو توانی بگەڕێتەوە، ئەوکات موبتەدعیش دەگەڕێتەوە لەو بیدعەیەی دەستی داوەتێ.

**سلام بن أبي مطيع** دەڵێ: سعيد بە أيوب السختياني وت: ئەی باوکی بکر، عمرو بن عبید وازی هێناوە و گەڕاوەتەوە لە ئیعتزال، -سلام دەڵێ:

خەڵکی لەو چەند ڕۆژەدا ئەو قسەیان دەکرد کە گوایە عمرو بن عبید تەوبەی کردووە- أیوب وتی: نەخێر نەگەڕاوەتەوە، وتی: با، گەڕاوەتەوە، وتی: نەخێر نەگەڕاوەتەوە، چەند جارێک ئەمەی وت، پاشان أیوب وتی :

مەگەر گوێت نەگرتووە بۆ قەولی ڕەسول الله ﷺ: « لە دین دەردەچن هەروەک چۆن تیر لە کەوان دەردەچێ، وە ناگەڕێنەوە بۆی هەتا ئەوکاتەی تیر بتوانێ بگەڕێتەوە بۆ شوێنی دەرچوونی لە کەوانەکە ». قەت ناگەڕێتەوە و تەوبە ناکات.

حدثني أحمد بن إبراهيم، حدثنا سعيد بن عامر، حدثنا سلام بن أبي مطيع، قال: قال سعيد لأيوب: يا أبا بكر، إنَّ عمرو بن عبيد قد رَجَعَ عن قوله، -قال سلام: وكان الناس قد قالوا ذالک تلک الأيام: إنَّه قد رَجَع- فقال أيوب: إنَّه لم يرجع، قال له: بلى، إنَّه قد رَجَع، قال: إنَّه لم يرجع، قالها غير مَرَّة، ثم قال أيوب: أما سمعتَ إلى قوله، يعني في الحديث: « **يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، ثُمَ لَا يَعُودُنَ فِيهِ حَتَى يَعُودَ السَّهْمُ عَلَى فُوَقِهِ** ». إنَّه لا يرجع أبدًا.

كتاب السنة لعبدالله | ٩٦١ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٨٦

**إبن شوذب** دەڵێ: بیستم عبدالله بن قاسم وتی: هیچ عەبدێک نییە لەسەر گومڕاییەک بێ دواتر وازی لێ بهێنێ ئیللا دەچێتە سەر شتێک لەو خراپتر. ئەمەم باسکرد بۆ هەندێک لە هاوەڵانمان، وتی: تەصدیقی ئەمە لە حدیثی ڕەسول الله ﷺ هاتووە: « لە دین دەردەچن هەروەک چۆن تیر لە کەوان دەردەچێ، وە ناگەڕێنەوە بۆی هەتا ئەوکاتەی تیر بتوانێ بگەڕێتەوە بۆ شوێنی دەرچوونی لە کەوانەکە ».

حدثنا أَسَد، قال: حدثنا ضَمرَة، عن ابن شَوذَب، قال: سمعت عبدالله بن القاسم، وهو يقول: ما كان عبدٌ على هَوى فَتَرَكه إلا إلى ما هوَ شَرٌّ منه. قال: فذَكرت هذا الحديث لبعض أَصحابنا، فقال: تصديقهُ في حديثٍ عن النبي ﷺ: « **يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّين كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّة، ثُمَ لَا يَرْجِعُونَ حَتَى يَرجِعَ السَّهْمُ إِلَى فُوَقِهِ** ».

كتاب البدع لابن وضاح ا ١٥٤

**محمد بن سيرين** دەڵێ: ئەگەر دەجال دەربچێ، دەبینی ئەهلی هەوا و ئارەزوو شوێنی دەکەون.

أخبرنا محمد بن عثمان بن محمد، قال: حدثنا محمد بن منصور، قال: حدثنا نَصر بن علي، قال: حدثنا أَبي، قال: حدثنا قُرة بن خالد، عن محمد بْنُ سِيرين: لَو خَرَجَ الدَجَّال، لَرَأَيتَ أنه سَيَتَبِعُه أَهل الْأَهواء.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٣٥ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٧٨٣

**سفيان الثوري** دەڵێ: موسڵمانان هەموویان بە لای ئێمەوە حاڵیان باشە ئیللا دوو جۆر نەبێ: ئەهلی بیدەع، لەگەڵ هاوەڵی سوڵتان و کاربەدەست کە دەچێتە لایان و تێکەڵە لەگەڵیان.

أخبرنا الحسن بن عثمان، قال: أخبرنا أحمد بن الحسن، قال: حدثنا الحسن بن علي، قال: حدثنا جعفر بن مسافر، قال: سمعت مؤمل بن إسماعيل، قال: سمعت سفيان، يقول: المسلمون كلهم عندنا على حالة حسنة إلا رجلين: صاحب بدعة، أو صاحب سلطان.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٥٥

**سفيان بن عيينة** دەڵێ: هەرکەسێک الله ﷻ بیپارێزێ و بەریئی بکات لەم گومڕاییانە ئەهلی هەوا و ئارەزوو، هەروەها بیپارێزێ لە سوڵتان، ئای چەندە حاڵی باشە.

وقال إسحاق بن أبي يحيى الكعبي، عن سفيان بن عيينة: مَن بَرَّأه الله ﷻ مِن هذه الأهواء، ومِن هذا السلطان، فما أحسن حاله!

الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٣٢٤

**حسان بن عطية** دەڵێ: هیچ قەومێک نین بیدعەیەک لە دینەکەیان دابهێنن، ئیللا الله ﷻ هاوشێوەی ئەو بیدعەیە لە سوننەت هەڵدەگرێ لە ناویاندا، هەتا ڕۆژی قیامەت نایگەڕێنێتەوە بۆیان.

أخبرنا أبو المغيرة، قال: حدثنا الأوزاعي، عن حَسَّان، قال: ما ابتدع قوم في دينهم بدعةً، إلا نَزَعَ الله مِن سُنَّتهم مِثلها، ثم لا يُعيدها إليهم إلى يوم القيامة.

سنن الدارمي ا ١٠١ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٢٣٩ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ١٢٩ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٩٢٧

أبي إدريس الخولاني دەڵێ: ئەگەر ببینم ئاگر لە مزگەوت بکەوێتەوە پێم خۆشترە هەتا بیدعەیەکی تێدا ببینم و نەگۆڕدرێ و نەهی لێنەکرێ.

حدثنا القافُلائي، قال: حدثنا الصَّاغاني، قال: حدثنا أحمد بن أبي الطيب، قال: حدثنا إسماعيل بن عياش، ومحمد بن حرب، عن أبي بكر بن أبي مريم، عن يزيد ابن شريح، عن أبي إدريس الخولاني، قال: لَئن أرى في المسجد نارًا تضطرم أَحَبُّ إليَّ مِن أرى فيه بدعةً لا تُغَيَّر.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٦٢٥

أبي إدريس الخولاني دەڵێ: ئەگەر ببیستم بەشێک لە مزگەوت ئاگری گرتووە و دەسوتێ پێم خۆشترە هەتا بیدعەیەکی تێدا ببیستم و کەسێک نەبێ بتوانێ بیگۆڕێ، وە هیچ ئوممەتێک نییە لە دینەکەیاندا بیدعەیەک دابهێنن ئیللا بە ئەندازەی ئەو بیدعەیە الله ﷻ سوننە لە شوێنەکەیدا هەڵدەگرێ.

حدثنا أَسَد، قال: حدثنا إسماعيل بن عياش، عن عقيل بن مُدِرك السُلمي، عن لقمان، عن أبي إدريس الخولاني، أنه كان يقول: لأن أَسمع

بناحية المسجد بنارٍ تُحرَق أحَبُّ إليَّ مِن أن أسمع فيه بدعةً ليس لها مُغَيِّر، وما أحدثت أُمَة في دينها بدعةً إلا رَفع الله بها عنهم سُنَّة.

كتاب البدع لابن وضاح | ٨٧

**الأوزاعي** دەڵێ: شوێن ئاثاری سەلەف بکەوە هەتا ئەگەر خەڵکیش ڕەفزیان کردیت و ڕازی نەبوون لێت، وە ئاگاداربە لە ڕەئی خەڵکی هەرچەندە جوانی بکەن و بە ڕازاوەیی نیشانتی بدەن.

حدثنا الفريابي، قال: حدثنا العباس بن الوليد بن مَزيد، قال: أخبرني أبي، قال: سمعت الأوزاعي، يقول: عليک بأثر مِن سَلَف وإن رفضک الناس، وإياک وآراء الرجال وإن زخرَفوا لک بالقَول.

كتاب الشريعة للآجري | ١٢٧

**يونس بن سليمان** دەڵێ: تەماشای زانستم کرد پێکهاتووە لە قورئان و ئەثەر، پاشان تەماشای ئەثەرم کرد، پێکهاتووە لە بە گەورە تەماشاکردنی پەروەردگار، وەصفی بەهەشت و جەهەنەم، حەڵاڵ و حەڕام، ئەمرکردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە، سیلەی ڕەحم، وە هەموو جۆرەکانی خێر

، پاشان تەماشای ڕەئیم کرد، بینیم پێکهاتووە لە فێڵ و خیانەت و دڵ ڕەقی و شتانێکی زۆر لە خراپە، ئیتر دەستم گرت بە ئەثەرەوە، ڕەئیم تەرک کرد.

أخبرنا أبو يعقوب، حدثنا الحسين بن محمد بن داود، أخبرنا المنذري، حدثنا أحمد ابن حَمدوية -هوَ القُهُندرُي- يقول: سمعت قتيبة، يقول: سمعت يونس بن سليمان عند عمر بن هارون يقول: نَظرت في العلم، فإذا القرآن والأثر، ثم نَظرت في الأثر، فإذا هو عظمة الرب وصفة الجنة والنار والحلال والحرام والأمر والنهي وصلة الرحم وأنواع الخير، ثم نَظرت في الرأي، فإذا هو الخديعة والمكر والخيانة والحِيَل وقسوة القلب وأشياء كثيرة مِنَ الشَّر، فأخذت الأثر، وتركت الرأي.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٠٧٢ شرف أصحاب الحديث للخطيبا ١٥٦

**أبو يوسف القاضي** دەڵێ: هەرکەسێک هەوڵ و طەلەبی دەست خستنی ماڵ بدات بە زانستی کیمیاء ئەوە موفلس دەبێ ، وە هەرکەسێک دینداری بە کەلام بکات ئەوە دەبێتە زەندیق و سەری لە کوفرەوە دەردەچێ.

أخبرنا أحمد بن محمد بن ميمون النهرسابسي بها، قال: حدثنا أبو بكر بن محمد بن موسى الخطيب النهرسابسي، قال: حدثنا أبو جعفر بن أبي

الدَّميک، قال: سمعت بشر بن الوليد الكِندي، يقول: سمعت أبا يوسف، يقول: مَن طَلَبَ المال بالكيمياء أُفلسَ، ومَن طَلَبَ الدِّينَ بالكلام تَزَندَقَّ.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٣٠٥ ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٠٠٩ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٦٩٥ شرف أصحاب الحديث للخطيب ا ٢ الكفاية في معرفة أصول علم الرواية للخطيب ا ٤٠٠ الحجة على تارک المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٢٣٢

**أبو يوسف القاضي** دەڵێ: شارەزا بوون بە کەلام هۆکار و پاڵنەرێکە بۆ زەندەقە.

حدثنا أبو بكر محمد بن القاسم النحوي، قال: حدثنا أبو بكر بن صدقة، قال: حدثنا أحمد بن الهيثم، قال: حدثنا أحمد بن محمد بن بشر، قال: سمعت هلال بن يحيى، يقول: سمعت أبا يوسف، يقول: العلم بالكلام يدعو إلى الزَندَقَّة.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٦٩٧

**مالک بن أنس** دەڵێ: هەرکەسێک دینداری بە کەلام بکات ئەوە دەبێتە زەندیق و سەری لە کوفرەوە دەردەچێ، وە هەرکەسێک هەوڵ و طەلەبی

دەست خستنی ماڵ بدات بە زانستی کیمیاء ئەوە موفلس دەبێ، وە هەرکەسێک شوێن غەریبی ئەحادیث و ئاثار بکەوێ، ئەوە بە درۆزن دادەنرێ.

أخبرنا أحمد بن محمد بن إسماعيل الهروي، أخبرنا إبراهيم بن أحمد الصائغ، أخبرنا إبراهيم بن أحمد المستملي، حدثنا علي بن الفضل، حدثنا عبدالرحمن بن محمد الجراحي، حدثنا محمد بن عَبيدة، حدثنا بشر بن أحمد الحارثي، أخبرنا إسحاق بن عيسى، عن مالک بن أنس، قال: مَن طَلَبَ الدِّينَ بالكلام تَزَندَقَّ، ومَن طَلَبَ المال بالكيمياء أفلسَ، ومَن طَلَبَ غَريب الحديث كُذِّب.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ٨٧٣

**عبدالله بن مبارک** دەڵێ: هەرکەسێک مەشغوڵ و سەرقاڵ بێ بە کەلام، ئەوە عاقیبەتی لە زەندیق بوونەوە دەردەچێ.

وقال ابن المبارک: مَن تعاطى الكلام تَزندق.

الشرح والإبانة لابن بطة ا ١٦٢

**عبدالرحمن ابن أبی حاتم** دەڵێ: باوکم و أبو زرعة دەیانوت: هەرکەسێک دینداری بە کەلام بکات ئەوە گومڕا دەبێ.

أخبرنا غالب بن علي، ومحمد بن الحسين بن المرزبان، قالا: أخبرنا جعفر بن عبدالله بن يعقوب الرازي، أخبرنا ابن أبي حاتم، قال: كان أبي وأبو زرعة يقولان: مَن طَلب الدِّينَ بالكلام، ضَلَّ.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٢٥٤

پرسیار کرا لە **أبو جعفر الباهلي** دەربارەی قسە کردن و وردبوونەوە و چوونە ناوەوە لە بابەتە کەلامیەکان، وتی: دەربارەی ئەمە پرسیار کرا لە الأوزاعي، وتی: خۆت بەدوور بگرە لە عیلمێک ئەگەر بشگەیتە ئاخر پلەی، بەهۆیەوە تۆمەتی زەندیقیت دەدرێتە پاڵ، دەست بگرە بە شوێنکەوتنی سەلەف و تەقلیدی چاکە ئەوەی ئەوان لەسەری بوون.

وسئل أبو جعفر الباهلي عن الخوض في الكلام: فقال: سئل الأوزاعي عنه، فقال: اجتنب علمًا إذا بلغت فيه المنتهى، نسبوك إلى الزندقة، وعليك بالاقتداء، والتقليد.

الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٢٢٧

پیاوێک بە **بشر بن أحمد أبي سهل الإسفراييني** وت: خۆم فێری کەلام دەکەم بۆ ئەوەی دینی پێ بناسم، تووڕە بوو بیستم وتی: مەگەر سەلەفی ئێمە لە زاناکانمان کافر بوون کاتێک نەهییان لە کەلام کردووە؟!

سمعت أحمد بن الحسن أبا الأشعث، يقول: قال رجل لِبشر بن أحمد أبي سهل الإسفراييني: إنما أتعلم الكلام لأعرف به الدين. فَغَضِبَ وسمعته قال: أَوَ كانَ السَّلَفُ مِن علمائنا كُفارًا؟!

ذم الكلام وأهله للهروي | ١٢٧٣

دەبینی سەلەف و ئەهلی سوننە و ئەهلی عیلم هۆشدارییان داوە لە ترسناکی ئەهلی بیدەع بە هەموو گرووپ و فیکرەکانیانەوە، وە ئاماژەیان داوە بەوەی دین بە ڕەئی و عەقڵ و کەلام وەربگری عاقیبەت سەرت لە زەندەقەوە دەردەچێ، بێگومان ڕاستیان وتووە، چونکە کاتێک عەقیدە و فیکرەیەکی باتڵ چوویە دڵ و مێشکەوە، ئەوە دەبێتە دین لای خاوەنەکەی، وە لەسەری بەردەوام دەبێت و تەرکی ناکات ئیللا مەگەر الله ﷻ ڕەحمی پێبکات و هیدایەتی بداتەوە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست و دینە صەحیحەکە.

تەماشای ذَرُّ بن عبدالله بن زرارة المرهبي الهمداني بکەن نمونەیەکی زیندووە بۆ ئەو قەولانەی هێنامان، ذر الهمداني ساڵی «٩٩» هیجری وەفاتی کردووە، مورجیئە بووە یەکەم کەس بووە قسەی لە ئیرجاء کردووە، وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە لەگەڵ حماد بن أبي سليمان پێکەوە قسەیان کردووە، کاتێک دەست دەکاتە دەعوە بۆ عەقیدەکەی سەرەتا وتوویەتی دەترسم ببێتە دین، بەڵام کاتێک خەڵک شوێن مەزهەبەکەی دەکەون و لە ناوچە جیاواز و دوورەکانەوە نامەی بۆ دەنێرن، ئەوکات باوەڕ دەکات ئەوەی دەعوەی بۆ دەکات دینە و بووەتە دین!

سلمة بن كهيل دەڵێ: ذر وەصف و باسی ئیرجائی دەکرد، وە ئەو یەکەمین کەس بوو قسەی تێدا کرد، پاشان دەیوت: دەترسم ئەمە ببێتە دین، کاتێک لە شوێنە جۆراو جۆرەکان و شارە دوورەکانەوە نامەی بۆ هات دەربارەی بابەتەکە، پاشان لێیم بیست دەیوت: ئەریٚ مەگەر بابەتەکە نەبووەتە دین، دین جگە لەمە چییە؟!

قال: حدثنا أبو عبدالله، قال: حدثنا هاشم بن القاسم، قال: حدثنا محمد بن طلحة، عن سلمة بن كُهَيل، قال: وَصَفَ ذَرٌّ الإرجاء وهو أول من تكَلَّمَ

فيه، ثم قال: إني أخاف أن يُتَّخذَ هذا دِيناً. قال: فلما أتته الكُتب مِن الآفاقِ، قال: فسمعته يقول بعد: وهل أمرُ غير هذا؟!

كتاب السنة للخلال | ١٥٢٣ الإبانة الكبرى لابن بطة | ١٣٣١

**الأعمش** دەڵێ: لە ذر الهمداني ـم بيست دەيوت: دەستم داوەتە ڕەئيەک هەڵگرى فيكرێكم، ترسم لێی هەيە ببێتە دين.

حدثني عثمان بن محمد بن أبي شيبة، حدثنا أبو أسامة، حدثنا سفيان، عن الأعمش، قال: سمعت ذَرًّا الهمداني، يقول: لقد أشرعت رأيًا، خِفتُ أن يُتخذ دِينًا.

كتاب السنة لعبدالله | ٦٨٠



# هەجر کردنی ئەهلی بیدەع و سووک کردن و دوورخستنەوەیان

ئەهلی بیدەع دەبێ هەجر بکرێن، نەک مەدح بکرێن، دەبێ ببوغزێنرێن، نەک زەردەخەنە بکرێ بە ڕوویاندا، دەبێ توند بن بەرامبەریان، نەک نەرمۆڵە و شل، دەبێ ڕوومەتتان هەتا دەگات بە دەرگایماڵتان داخراو بێ بە ڕوویاندا، نەک ڕوومەتتان گەشاوەبێ بەرامبەریان و ماڵیشتان لەسەر پشتبێ بۆیان! من قەراربێ پێشوازی لە شوانێکی بەڕێز بکەم ناهێڵم سەگەکەی بێنێتە ماڵم چ جای ئەوەی ماڵم بخەمە سەر پشت بۆ ئەهلی بیدەع و ئەهلی شیرک و ئەڵقە لە گوێکانیان.

سائب بن یزید دەڵێ: هەندێک کەس هاتنە لای عمر بن الخطاب رضي الله عنه، وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئێمە گەیشتین بە پیاوێک دەربارەی تەئویلی قورئان پرسیار دەکات -واتە موتەشابیهـ- وتی: اللهم بیهێنێتە بەردەستم، هەتا جارێک عمر لەگەڵ خەڵکیدا دانیشتبوو خواردنی پێدەدان، لەپڕ ئەو کەسە هات جلێکی ڕێک و پێکی لەبەردا بوو عەمامەشی بەستبوو دەستی کرد بە نان خواردن، کە تێری خوارد هات وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران: ﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا * فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا﴾.

یانی چی؟ عمر وتی: تۆ ئەو کەسەی؟ ئیتر هەستایەوە بۆی قۆڵی لێهەڵماڵی هەتا توانی دارکاری کرد تا ئەوەی عەمامەکەی لەسەری کەوتە خوارەوە، ئەنجا وتی: سوێند بەو زاتەی گیانی عمری بە دەستە ئەگەر سەرت سفر بووایە دەمدا لە ملت و سەرم دەپەڕاندی، هەستن جلەکانی بکەنەوە بەری، وە بە سواری بینێرنەوە بۆ ناوچەکەی خۆی، پاشان بڵێن: صبیغ بە دوای عیلمەوە بوو لە دووی عیلم دەگەڕا، بەڵام نەیپێکا و نەیتوانی بە دەستی بهێنێ، هەتا مرد هەر سووک بوو، لەکاتێکدا پێشتر گەورەی قەومەکەی بوو.

حدثنا أبو بكر بن عبدالله بن محمد بن عبدالحميد الواسطي، قال: حدثنا إسماعيل بن أبي الحارث، قال: حدثنا مَكي بن إبراهيم، قال: حدثنا الجُعيد بن عبدالرحمن، عن يزيد بن خُصيفة، عن السائب بن يزيد، قال: أُتي عمر بن الخطاب رضي الله عنه، فقيل: يا أمير المؤمنين، إنا لقينا رجلاً يسأل عن تأويل القرآن، فقال: اللَّهم أمكِنِي منه. فبينا عمر ذات يوم جالساً يُغدي الناس، إذ جاءه عليه ثياب وعمامة فتغدى، حتى إذا فرغ، قال: يا أمير المؤمنين: ﴿ وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا * فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا ﴾. فقال عمر: أنت هو؟ فقام إليه فَحَسرَ عن ذراعَيه فلم يزل يجلده حتى سقطت عمامته،

فقال: والذي نفس عمر بيده لو وجدتک محلوقاً لضربت رأسک، ألبسوه ثيابه واحملوه على قتبٍ، ثم أخرجوه حتى تقدموا به بلاده، ثم ليقم خطيبًا، ثم ليقل: إنَّ صبيغًا ابتغى العلم فأخطأه، فلم يزل وضيعًا في قومه حتى هلک، وکان سيد قَومه.

كتاب الشريعة للآجري | ١٥٢ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٣٥٥ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ١١٣٦

**أبو عثمان النهدي** دەڵێ: پیاوێک لە هۆزی یربوع پێی دەوترا صبیغ، پرسیاری کرد لە عمر بن الخطاب رضي الله عنه لە ئایەتەکانی: ﴿الذاريات﴾. ﴿النازعات﴾. ﴿المرسلات﴾. یاخود دانەیەک لەو ئایەتانە. عمر پێی وت: ئەو عەمامەیەی سەرت لابە و سەرت ببینم. ئەویش سەری ڕووت کرد، قژی هەبوو، پێی وت: والله ئەگەر سەرت سفر بووایە ئەوە ئەو کەلە سەرەتم دەپەڕاند کە چاوەکانتی تێدایە.

پاشان نوسی بۆ ئەهلی بەصرە: لەگەڵی دامەنیشن، دەڵێ: جاری وا هەبوو سەد کەس بووین صبیغ دەهاتە ناومان هەڵدەستاین و جێهان دەهێشت.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم محمد بن إدريس الرازي، قال: حدثنا محمد بن عبدالأعلى، قال: حدثنا المعتمر، عن أبيه، قال: حدثنا أبو عثمان: أن رجلاً من بني يربوع يقال له: صَبيغ، سأل عمر بن الخطاب رضي الله عنه، عن ﴿الذاريات﴾. و ﴿النازعات﴾. و ﴿المرسلات﴾. أو عن إحداهن، فقال له عمر: ضع عن رأسك. فوضع عن رأسه، فإذا له وفيرة، فقال: لو وجدتك محلوقًا لضربت الذي فيه عيناك.

قال: ثم كَتَبَ إلى أهل البصرة: أن لا تُجالسوه. أو قال: كَتَبَ إلينا: لا تُجالسوه. قال: فلو جلس إلينا، ونحن مائة لتفرقنا عنه.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٣٥٤ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ١١٣٧ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٧١٩

**سليمان بن يسار** دەڵێ: پیاوێک هەبوو لە هۆزی تەمیم پێی دەوترا: صبيغ بن عسل، هاتە مەدینە هەندێک کتێبی لابوو، دەگەیشتە هەرکەسێک پرسیاری موتەشابهی قورئانی لێدەکرد، ئەمەیان بۆ عمر گێڕایەوە، ناردی بەدوایدا، وە هەندێک پەلکی بۆشکە خورمای بۆ حازر کردبوو، کاتێک هات بۆ لای لێی پرسی تۆ کێی؟ وتی: من بەندەی الله ـم صبيغ. عمر ـیش وتی: منیش بەندەی الله ـم عمر، ئەنجا هەستایەوە

بۆی بە پەلکی دارخورماکە هەتا توانی لێیدا، بەردەوام بوو لە لێدانی هەتا سەری شکاند و خوێن بە ڕوومەتیدا هاتە خوارەوە. وتی: بەسە ئەی ئەمیری باوەڕداران والله ئەو شوبهاتەی لە مێشکمدا بوو ڕۆیشت و نەما. پاشان خەلیفە ئەمری کرد لە مەدینە دەربکرێت و ناردیان بۆ بەصرە، وە نامەشی نووسی بۆ موسڵمانەکان هەتا توخنی نەکەون و لەگەڵی دانەنیشن.

أخبرنا أبو عبيد علي بن الحسين بن حرب القاضي، قال: حدثنا أبو الأشعث، أحمد بن المقدام، قال: حدثنا حماد بن زيد، عن زيد بن حازم، عن سليمان بن يسار: أن رجلًا مِن بني تميم يقال له: صَبيغ بن عِسل، قَدِمَ الْمدينة، وكان عنده كُتب، فجعل يسأل عن متشابه القرآن، فبلغ ذالک عُمَر فبعث إليه، وأعدَّ له عراجين النَّخل، فلما دخل عليه قال: مَن أنت؟ قال: أنا عبدالله صَبيغ. قال عمر: وأنا عبدالله عُمَر. وأومأ إليه فجعل يضربه بتلك العراجين، فما زال يضربه حتى شَجَّهُ وجعل الدَّم يسيل على وجهه. فقال: حَسبُکَ يا أمير المؤمنين، فقد والله ذهب الذي أجد في رأسي. ثم أمر بإخراجه إلى البصرة وكَتب إلى المسلمين ألَّا تُجالِسوه.

كتاب الشريعة للآجري ا ١٥٣ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ١١٣٧ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٧١٨

وتم: صبیغ لە سەردەمی صەحابەدا ژیاوە هەندێک لەو صەحابانەی مۆژدەی بەهەشتیان پێدرابوو دەیبینین، کاتێک تووشی بیدعە دەبێت و خەڵکی تاقیدەکاتەوە و تووشی میحنەیان دەکات، ئیمامی عمر بەو شێوەیە تەمیەی دەکات و نەفی دەکات، پەراوێزخراو کەس حسابی بۆ نەدەکرد هەتا بەو حەسرەتەوە مرد.

جا ئەوەی صبیغ تووشی بوو لە نەفی کردن و ساقط بوون عاقیبەتی هەموو کەسێکە دەعوە بۆ باتڵ بکات و شوبهات بڵاوبکاتەوە.

لەوانەیە بپرسن بۆچی ئیمامی عمر رضي الله عنه بە صبیغ ـی وتووە: ئەگەر کەچەڵ بوویتایە سەرت سفر کردبووایە ئەوە دەمدا لە ملت؟

لە وەڵامدا دەڵێم: لەبەرئەوەی سەر سفر کردن نیشانەیەک بووە بۆ عەقیدەی خەوارج، هەروەک چۆن ڕەسول الله ﷺ کاتێک وەصفی خەوارج دەکات بۆ هاوەڵان، دەفەرموێ: « سِيمَاهُمْ التَحْلِيق ». واتە نیشانەی ناسینەوەیان سەر سفر کردنە.

حَدَّثنا أَبُو النُّعْمَانِ، حَدَّثَنَا مَهْدِيُّ بْنُ مَيْمُونٍ، سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ سِيرِينَ يُحَدِّثُ عَنْ مَعْبَدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: « يَخْرُجُ نَاسٌ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ، وَيَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، ثُمَّ لاَ يَعُودُونَ فِيهِ حَتَّى يَعُودَ السَّهْمُ إِلَى فُوقِهِ ». قِيلَ: مَا سِيمَاهُمْ؟ قَالَ: «سِيمَاهُمُ التَّحْلِيقُ». أَوْ قَالَ: « التَّسْبِيدُ ».

صحيح البخاري | ٧٥٦٢ مسند أحمد | ١١٦١٤

حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَاصِمٍ الْأَنْطَاكِيُّ، حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ وَمُبَشِّرٌ -يَعْنِي ابْنَ إِسْمَاعِيلَ الْحَلَبِيَّ- عَنْ أَبِي عَمْرٍو، قَالَ -يَعْنِي الْوَلِيدَ-: حَدَّثَنَا أَبُو عَمْرٍو، قَالَ: حَدَّثَنِي قَتَادَةُ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، قَالَ: « سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي اخْتِلَافٌ وَفُرْقَةٌ، قَوْمٌ يُحْسِنُونَ الْقِيلَ وَيُسِيئُونَ الْفِعْلَ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ، لَا يَرْجِعُونَ حَتَّى يَرْتَدَّ عَلَى فُوقِهِ، هُمْ شَرُّ الْخَلْقِ وَالْخَلِيقَةِ، طُوبَى لِمَنْ قَتَلَهُمْ وَقَتَلُوهُ،

يَدْعُونَ إِلَى كِتَابِ اللهِ وَلَيْسُوا مِنْهُ فِي شَيْءٍ، مَنْ قَاتَلَهُمْ كَانَ أَوْلَى بِاللهِ مِنْهُمْ ». قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّه، مَا سِيمَاهُمْ؟ قَالَ: « التَّحْلِيقُ ».

سنن أبي داود | ٤٧٦٥ مسند أحمد | ١٣٣٣٨

حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا عَبْدُالرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَحْوَهُ، قَالَ: « سِيمَاهُمُ التَّحْلِيقُ وَالتَّسْبِيدُ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمْ فَأَنِيمُوهُمْ ». قَالَ أَبُو دَاوُدَ: التَّسْبِيدُ: اسْتِئْصَالُ الشَّعْرِ .

سنن أبي داود | ٤٧٦٦ سنن ابن ماجه | ١٧٥ مسند أحمد | ١٣٠٣٦

شافعي دەڵێ: حوکمی من دەربارەی ئەهلی کەلام، هەمان حوکمی عمر بن الخطاب ـە بۆ صبيغ. واتە دارکاری کردن و دوورخستنەوە و هەجر کردن.

أخبرنا إسماعيل بن إبراهيم، حدثنا محمد بن عبدالله، حدثنا أبو خالد حسان بن محمد، حدثني إبراهيم بن محمود، حدثني أبو سليمان، حدثني الحسن بن علي، سمعت الشافعي، يقول: حُكمي في أهل الكلام، حُكم عُمر في صَبيغ.

ذم الكلام وأهله للهروي | ٧٢٠

**نافع** دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای عبدالله بن عمر رضي الله عنهما، وتی: فڵان سەلامی هەبوو بۆت. وتی: پێم گەیشتووە کە تووشی بیدعە بووە، ئەگەر وایە بیدعەی داهێناوە ئەوە سەلامی منی پێ مەگەیێنە.

أخبرنا أبو عاصم، أنبأنا حَيوَةُ بن شُرَيح، حدثني أبو صَخر، عن نافع، عن ابن عمر رضي الله عنه، أنه جاءه رَجُل، فقال: إنَّ فُلانًا يقرأ عليكَ السلام. قال: بلَغَني أنَّه قد أحدَث، فإن كان أحدَثَ فلا تَقرَأ عليه السلام.

سنن الدارمي | ٤٠٥ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي | ٢٤٨

**عمرو بن دینار** دەڵێ: کاتێک طاووس طەوافی دەکرد بە دەوری کەعبەدا معبد الجهني پێگەیشت، طاووس پێی وت: تۆ معبد ـی؟ وتی: بەڵێ. طاووس لای کردەوە بۆ خەڵکەکە وتی: ئەوە معبد ـە سووکی بکەن.

حدثنا أبو علي إسماعيل بن محمد الصفَّار، قال: حدثنا أحمد بن منصور الرمادي، قال: حدثنا عبدالرزاق، قال: أخبرنا ابن عيينة، قال: حدثنا عمرو بن دينار، قال: بينا طاووس يطوف بالبيت لقيه معبد الجهني، فقال

لە طاووس: أنت معبد؟ قال: نعم. قال: فالتفت إليهم طاووس، فقال: هذا معبدُ فأهينوه.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٢٠٩١ كتاب السنة لعبدالله | ٨٣١ كتاب السنة لحرب الكرماني | ٦٠٥ كتاب القدر للفريابي | ٢٦٦ كتاب الشريعة للآجري | ٥٤٨ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ١١٤١

ئەم ئەثەرە لای **عبدالله** و **حرب** و **الفريابي** و **الآجري** بەم لەفظە هاتووە: قال عمرو: قال لنا طاووس: أُخزوا مَعبَدًا الجُهَني، فإنه قَدَري.

**عبدالله بن عمر السرخسي** دەڵێ: جارێک لای خاوەن بیدعەیەک نانم خوارد، ئەمە گەیشتەوە بە عبدالله بن مبارک، وتی: سی ڕۆژ قسەی لەگەڵ ناکەم.

أخبرنا الحسن بن عثمان، قال: أخبرنا أحمد بن حمدان، قال: حدثنا أحمد بن الحسين، قال: حدثنا عبدالصمد، قال: حدثنا عبدالله بن عمر السرخسي -عَلَمُ الحُزن- قال: أكلتُ عند صاحب بدعة أكلة، فبلغ ذالک ابن المبارک، فقال: لا كلمته ثلاثين يومًا.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٧٤ الشرح والإبانة لابن بطة ا ١٦٦

**فضيل بن عياض** دەڵێ: عبدالله بن مبارک دەیوت: هیچ پارە و ماڵێکم نەدیوە هێندەی پارە و ماڵی خاوەن بیدعە بێ بەرەکەت بێ، هەروەها وتی: اللهم هیچ خاوەن بیدعەیەک وا لێنەکەی لە لای من دەسەڵات و دەست ڕۆشتوو بێ، هەتا دڵم خۆشی بوێ.

أخبرنا الحسن بن عثمان، قال: أخبرنا أحمد، قال: حدثنا أحمد بن الحسن، قال: حدثنا عبدالصمد، قال: سمعت الفضيل، يقول: قال ابن المبارك: لم أَرَ مالًا أَمحَق مِن مال صاحب بدعة، وقال: اللهم لا تجعل صاحب بدعة عندي يدًا، فيحبه قلبي.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٧٥

**معن بن عيسى** دەڵێ: مالک بن أنس وتی: خەلیفەی باوەڕداران هارون الرشيد هاتە مەدینە بە نیازی حەج کردن بوو، یعقوب ـی لەگەڵ بوو کە پێی دەوترا: أبو يوسف، مالک چووە مەجلسی خەلیفەی باوەڕداران، ئەویش نزیکی کردەوە لە خۆی و ڕێزی لێگرت، کاتێک دانیشت یعقوب

ڕووی تێکرد و دەربارەی مەسئەلەیەک پرسیارێکی لێکرد، مالک وەڵامی نەدایەوە. دووبارە پرسیارەکەی لێکردەوە، وەڵامی نەدایەوە. ئەمجارەش پرسیارەکەی لێکردەوە، هەر وەڵامی نەدایەوە. هارون بە مالک ـی ووت: ئەی باوکی عبدالله، ئەمە یعقوب ـە قاضی ئێمەیە پرسیاری هەیە لێت. مالک ڕووی تێکرد و وتی: هەرکات ئێمەت بینی لەگەڵ ئەهلی باتڵ دانیشتین، ئەوکات لەگەڵ ئەوان وەرە با وەڵامت بدەینەوە.

أخبرنا جعفر بن محمد الفريابي، حدثنا محمد بن محمد بن عبدالله إملاءً: حدثنا محمد بن محمد الأنماطي، حدثنا محمد بن إبراهيم البوسنجي، حدثنا قُتيبة، قال: سمعت مَعنَ بن عيسى، عن مالک بن أنس، قال: قَدِمَ هارون الرشيد أمير المؤمنين المدينة يريد الحج، ومعه يعقوب الذي يقال له: أبو يوسف، فأتى مالک أمير المؤمنينَ فقربه وأكرمه، فلما جلس أقبل عليه يعقوب فسأله عن مسألة ، فلم يُجبه! ثم عاد، فلم يُجبه، ثم عاد، فلم يُجبه! فقال هارون لمالک: يا أبا عبدالله، هذا يعقوب قاضينا يسألک. فأقبل عليه مالک، فقال: يا هذا، إذا رأيتنا جلسنا لأهل الباطل، فاحضر معهم نُجِيبک.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ٩٠٨

قاضي أبو يوسف يعقوب بن إبراهيم بن حبيب الكوفي، ساڵی «١٨٢» هیجری وەفاتی کردووە، قاضي بووە لە سەردەمی خەلیفە هارون الرشید، ئەهلی ڕەئی بووە، هەروەها تەلەبەی أبو حنيفة بووە.

**محمد بن عثمان النجيمي** دەڵێ: حسين بن الشماخ ڕێگەی نەدەدا هیچ کەسێک لە ئەهلی ڕەئی ڕیوایەتی لێوە بنوسن، پیاوێک لە خەڵکی مەغریب سوێندی دا بە الله، وە باسی ئەوەی کرد لە جێگایەکی دوورەوە هاتووە بۆ طەلەبی عیلم، هیچ حدیثێکی بۆ نەگێڕایەوە، بەڵکو شتێکی لە خراپی و موخالەفە و غەڵەتەکانی أبو حنیفە ـی بۆ گێڕایەوە.

سمعت محمد بن عثمان النُجيمي، يقول: كان الحسين بن الشَّماخ الحافظ لا يَدَع أحدًا مِن أهل الرأي يَكتُب عنه، فَنَشَده رَجُل مِن أهل المغرب بالله وذَكَرَ له طولَ الرِّحلة، فروى له شيئًا مِن مَساوئ أبي حنيفة، ولم يُحَدِثه بحديث.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٢٨٩

**حبش بن الورد** دەڵێ: أسود بن سالم بینرا ڕوومەتی دەشوشت لە بەیانیەوە هەتا نیوەی ڕۆژ هەر خەریکی شۆرینی بوو، پێی وترا: چیبووە

مەسەلەی تۆ چییە؟ وتی: ئەمڕۆ موبتەدعێکم بینی، لەو کاتەوەی دیومە هەتا ئێستا ڕوومەتم دەشۆم، وا هەست دەکەم پاک نابێتەوە!

أخبرنا الحسين بن علي الطناجيري، حدثنا محمد بن علي بن سويد المُؤَدّب، حدثنا عثمان بن إسماعيل بن بكر السُّكَري، قال: سمعت حبش بن الورد، يقول: رُؤِيَ أسود ابن سالم يَغسل وجهه مِن غدوَةٍ إلى نصف النهار، فقيل له: إيش خَبَرَك؟ قال: رأيت اليوم مُبتدعًا، فأنا أغسل وجهي مُنذُ رأيته إلى الساعة، وأنا أظنه لا ينقى!

تاريخ بغداد للخطيب | **(٣٩/٧)** ذم الكلام وأهله للهروي | ١٠٩٨

ئەم ئەثەرە لای **الهروي** بەم لەفظە هاتووە: قال رجل لأسود بن سالم: كيف أصبحت؟ قال: بِشَرٍّ، وَقَعَت عيني على مُبتَدع.

**أبو إسماعيل الأنصاري الهروي** دەڵێ: پرسیارم کرد لە يحيى بن عمار، دەربارەی إبن حبان، وتم: بینیوتە؟ وتی: چۆن نەم دیوە! ئێمە لە سجستان دەرمان کرد، خاوەن عیلمێکی زۆر بوو، بەڵام دینێکی زۆری نەبوو، هات بۆ لامان حەدی بۆ الله ﷻ ڕەتکردەوە، ئیتر لە سجستان دەرمانکرد.

وسألت يحيى بن عمار، عن أبي حاتم ابن حِبَّان البُستي؟ قلت: رأيته؟ قال: كيف لم أَرَه! ونحن أخرجناه مِن سِجستان، كان له علم كثير، ولم يكن له كبير دِين، قَدِمَ علينا، فأنكر الحَدَّ لله، فأخرجناه من سِجِستان.

ذم الكلام وأهله للهروي | ١٢٩٢

**أبو إسماعيل الأنصاري الهروي** دەڵێ: له أحمد بن حمزة و أبا علي الحداد ــم بيست دەيانوت: أبا عباس أحمد بن محمد النهاوندي ــمان بینی نەهی و ئینكاری دەكرد له ئەهلی كەلام، وە تەكفیری ئەشاعیرەی دەكرد، هەروەها باسی ئەوەی كرد چەندە توند بووە لەسەر محمد بن عمر أبي الفوارس القرمسيني، هەجری كرد لەسەر ئەوەی ڕستەیەكی وتووە له ئەقوالی ئەهلی كەلام.

سمعت أَحمد بن حمزة، وأَبا علي الحَداد، يقولان: وجَدنا أَبا العباس أَحمد بن محمد النهاوندي على الإِنكار على أَهل الكلام، وتكفير الأَشاعرة، وذَكر أَعظم شَأنه في الإِنكار على أَبي الفوارس القَرمَسِيني، وهجرانه إِيَاه لحرف واحد.

ذم الكلام وأَهله للهروي | ١٢٩٥

وە بیستم لە **أحمد بن أبی ڕافع** و خەڵکانێکی تر باسی توندی أبي حامد یان دەکرد بەرامبەر الباقلاني، وتی: من نامەی أبو سعید م گەیاندە سالم ی کوڕی کە لە بەغداد بوو، نوسیبووی ئەگەر دەتەوێ بگەڕێیتەوە بۆ هراة، ئەوە نزیکی الباقلاني نەبیتەوە.

وسمعت أحمد بن أبي رافع، وخلقًا يذكرون شِدَّة أبي حامد على الباقِلاني، قال: وأنا بَلَّغتُ رِسالة أبي سعيد إلى إبنه سالم -ببغداد- إن كنت تُريد أن ترجع إلى هَراة، فلا تَقرب الباقِلاني.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٣٠٥

**حسن بن أبي أسامة** دەڵێ: بیستم باوکم دەیوت: لەعنەتی الله لە أبو ذر بێ، ئەو یەکەمین کەس بوو عەقیدەی ئەشعەری گەیاندە حەرەمی مەککە، وە یەکەم کەسیش بوو بڵاوی کردەوە لە ناو ئەهلی مەغریبدا.

سمعت الحسن بن أبي أُسامة المكي، يقول: سمعت أبي، يقول :لَعَنَ الله أبا ذَرٍّ، فإنه أول مَن حَمَلَ الكلام إلى الحَرَم، وأول من بَثَّه في المغاربة.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٣١٦

# تەرک کردنی هاوڕێیەتی کەسانێک کە دەبنە نەخۆشی بۆ دڵ

ئینسان هەرچەندە دەعوای ئەوە بکات ئەهلی سوننەیە و فیکرە ئەصیلەکەی خۆی ستر بکات، لەگەڵ ئەوەشدا تێکەڵی هەموو جۆرە کەسانێکی بیدعەچی و عەقیدە باتڵ و صۆفی قبوری و ئەشاعیرەی موعەطیلّەی صیفات بکات، وە لەگەڵ هەر گرووپێک لە گرووپە گومڕاکان بینرا و نەرم و شل بوو بەرامبەریان، ئەوە سائغە گومانی خراپی پێ ببرێ، سەلەف بەو جۆرە مامەڵەیان لەگەڵ ئەو جۆرە خەڵکانە کردووە، یەکێک لەو هۆکارانەی کە بووەتە هۆی لادانی ئەشخاص لە ڕێگای ڕاست، ڕەفیقایەتی و دانیشتنە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە ئەمین نیت لێیان و دەکرێ ببنە فیتنە بۆت و دڵت وەرگەڕێنن لە دینی حەق.

**عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه دەڵێ: ئیعتبار دانان بۆ خەڵکی و حوکمدان بەسەریاندا لە هاوڕێکانیانەوە ببینن، چونکە ئینسان هاوڕێیەتی کەسێک ناکات ئیللا بە دڵی نەبێ.

حدثنا أبو زياد بن ربيعة بن الحارث الخولاني الحمصي، قال: حدثنا جعفر بن عبدالله السالمي الأشجعي، قال: حدثنا يزيد بن عطاء، قال: قال

عبدالله بن مسعود رضي الله عنه: اعتبروا الناس بأخدانهم، فإن المَرءَ لا يُخادن إِلَّا مَن يُعجبُه.

كتاب السنة للخلال | ٢٣٨١ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٠٧

**عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه دەڵێ: ئینسان لەگەڵ ئەو کەسەدا دێت و دەچێ و هاوڕێیەتی دەکات کە خۆشیدەوێ، هەروەها وەک خۆیەتی لە فیکر و بۆچووندا.

حدثني أبو محمد بن أيوب، قال: حدثنا إسماعيل بن إسحاق القاضي، قال: حدثنا سليمان بن حرب، قال: حدثنا شعبة، عن أبي إسحاق، عن هُبيرة، عن عبدالله بن مسعود رضي الله عنه، قال: إنما يُماشي الرجلُ ويصاحبُ مَن يُحبُّ، ومَن مثله.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٢٦

**سفيان بن عيينة** دەڵێ: هیچ شتێک نییە هێندەی هاوڕێ کاریگەری هەبێ لەسەر چاک بوون و خراپ بوونی شەخصەکان.

حدثنا إسحاق الكاذي، قال: حدثنا عبدالله بن أحمد بن حنبل، قال: وجدت في كتاب أَبي: حدثنا أَبو معاوية الغَلّابي، قال: قال سفيان: ليس شيءُ أَبلغُ في فساد رجلٍ وصلاحه مِن صاحبٍ.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٣١

**الأوزاعي** دەڵێ: ئەو کەسەی کە بیدعەکەی شاراوەیە لامان و دەری ناخات، ئەوە ئەو ئولفەتەی هەیەتی بۆ ئەهلی بیدەع ون نابێ لێیان.

حدثنا يحيى بن طالب، قال: حدثنا محمد بن سهم، قال: سمعت بقية، قال كان الأَوزاعي يقول: مَن سَترَ عَلينا بدعته، لم تَخْفَ عَلينا أُلْفَتَهُ.

كتاب السنة للخلال | ٢٣٨٥ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٥١

ئەم ئەثەرەی الأَوزاعي، أَبو القاسم اللالكائي ـش لە غیری ڕێگەکەی بقية بن وليد لە ڕێگەی سلمة بن كلثوم بەهەمان لەفظ و مەتن هێناویەتی.

أَخبرنا الحسن بن عثمان، قال: أَخبرنا أَحمد بن الحسين، قال: حدثنا سليمان بن الأَشعث، قال: حدثنا أَبو تَوبة، قال: حدثنا سلمة -يعني ابن كلثوم- عن الأَوزاعي، قال: مَن استَتَرَ عَلينا ببدعته، لم تَخَف عَلينا أُلْفَتَهُ.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٥٧

ئەم ئەثەرەی سەرەوە ڕوون و وازحە، هەرکەسێک مەستور حال بێ، بیدعەکەی نیشان نەدات، بەڵام کاتێک بینیت هەڵسوکەوت و تێکەڵاوی لەگەڵ ئەهلی بیدەع هەبوو، ئەوکات هەمان حوکمی ئەهلی بیدەع دەدەرێ بەسەریدا.

**معاذ بن معاذ** دەڵێ: بە یحیی بن سعید ـم وت: ئەی باوکی یحیی ئەگەر پیاو ڕاوبۆچوون و عەقیدەی بشارێتەوە، ئەوە ناشارێتەوە ناتوانێ بیشارێتەوە لە کوڕ و هاوڕێ و ئەو کەسەی لەگەڵی دادەنیشێ.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا محمد بن أبي صفوان الثقفي، قال: سمعت معاذ بن معاذ، يقول: قلت ليحيى بن سعيد: يا أبا سعيد، الرجلُ وإن كَتَمَ رأيه لم يخفَ ذاك في ابنه، ولا صديقه، ولا في جليسه.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٣٦

**محمد بن عبيدالله الغلابي** دەڵێ: وتراوە: ئەهلی هەوا و ئارەزوو هەموو شتێک دەشارنەوە بێجگە لە ئولفەت و هاوڕێیەتی، ئەم دووانە ناشارنەوە و ناتوانن بیشارنەوە.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا محمد بن الحسين بن حسان الهاشمي، قال: سمعت محمد بن عبيدالله الغلابي، يقول: كان يُقال: يَتَكاتُم أَهل الأَهواء كلَّ شيءٍ إلا التألف والصُّحبة.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٣٧

قتادة دەڵێ: والله ئێمە پیاوێکمان نەدیوە هاوڕێیەتی کەسانێک بکات ئیللا وەک خۆی نەبن، کەواتە هاوڕێیەتی پیاو چاکان بکەن لە عەبدەکانی الله ﷻ، بەڵکو لەگەڵ ئەواندا بن و حسابتان بۆ بکرێ یاخود وەک ئەوان بن.

حدثنا أبو القاسم، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا محمد بن سعيد السَّكن، قال: حدثنا يونس بن عطية، قال: قال قتادة: إِنَّا والله ما رأينا الرجل يُصاحبُ مِنَ الناس إلا مثله وشكله، فصاحبوا الصالحين من عباد الله لعلكم أن تكونوا معهم أو مثلهم.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٣٨

**مالک بن دینار** دەڵێ: خەڵکی جۆراو جۆرن وەک جۆراو جۆری تەیرەکان، کۆتر لەگەڵ کۆتر، قەلەڕەش لەگەڵ قەلەڕەش، قاز لەگەڵ قاز، الصعو لەگەڵ الصعو، ئەمانە هەریەک لەگەڵ هاوشێوەکەی خۆی هەڵسوکەوت دەکات، ئینسانیش بەهەمان شێوە هەر ئینسانێک لەگەڵ هاوشێوکەی خۆی هەڵسوکەوت دەکات.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا مُؤمَّل ابن إهاب الرَّبعي، قال: حدثنا سيَّار، عن جعفر، قال: سمعت مالك بن دينار، يقول: الناس أَجناسٌ كأَجناسُ الطير، الحمام مع الحمام، والغُراب مع الغُراب، والَبَطِّ مع البَطِّ، والصَّعوُ مع الصَّعوِ، وكل إنسان مع شكله.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٥٣٩

**أبو حاتم** دەڵێ: موسی بن عقبة الصوري هاتە بەغداد، ئەمەیان باسکرد بۆ أحمد بن حنبل، ئەویش وتی: تەماشای بکەن بزانن لە کوێ لە ماڵی کێ دابەزیوە و لای کێ دادەنیشێ و دەمێنێتەوە.

قال أبو حاتم: وَقَدِمَ موسى بن عقبة الصُّوري بغداد، فَذُكِرَ لأحمد بن حنبل، قال: انظروا على مَن نَزَل، وإلى مَن يأوى.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٣٩/ب

**هشام بن عروة** دەڵێ: عمر بن عبدالعزيز هەندێک خەڵکی گرت لەسەر مەشروب خواردن، حەدی بەسەردا جێبەجێ کردن و لێیدان، یەکێکیان لەگەڵ بوو بەڕۆژوو بوو، وتیان: ئەوەیان نەیخواردووەتەوە بەڵکو بەڕۆژووە! ئەویش ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ﴾.

حدثنا المثنى، قال: حدثنا إسحاق، قال: حدثنا عبدالله بن إدريس، عن العلاء بن مِنهال، عن هشام بن عروة، قال: أَخَذَ عمر بن عبدالعزيز قومًا على شرابٍ، فَضَرَبَهُم وفيهم صائمٌ، فقالوا: إِنَّ هذا صائم! فتلا: ﴿ فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ﴾.

تفسير الطبري | **(١٧٨٣/٧)** تفسير ابن أبي حاتم | **(٤٣٣٨/٤)** الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٤٠

ئەم ئەثەرە لای **إبن بطة** بەم لەفظە هاتووە: أَنَّ عمر بن عبدالعزيز أَخَذَ قومًا على شرابٍ، ومعهم رجلُ صائمُ، فضربه معهم، فقيل له: إِنَّ هذا صائم! فقال: ﴿ فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ﴾.

وە خودی **إبن جرير الطبري** لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا دەڵێ: لەم ئایەتە دەلالەتی وازحی تێدایە نەهی کردووە لە دانیشتن لە مەجلسی ئەهلی باتڵ بە هەموو جۆرەکانیانەوە ئەهلی بیدەع و ئەهلی فیسق، کاتێک ڕۆدەچن لە باتڵەکەیان و قسەی تێدا دەکەن.

وفي هذه الآية الدلالة الواضحة على النهي عن مُجالسة أهل الباطل مِن كُل نَوعٍ مِنَ المُبتَدِعة والفَسَقة، عند خوضهم في باطلهم.

**أبو قلابة** دەڵێ: أبو الدرداء دەڵێ: لە فقهی پیاوە بزانێ لەگەڵ کێ هەڵسوکەوت دەکات، دەچێتە لای کێ، لەگەڵ کێ دەچێتە دەرەوە. پاشان أبو قلابة دەڵێ: الله شاعیر بکوژێ کە وتوویەتی:

پرسیار لە حاڵی ئینسان مەکە بەڵکو تەماشای هاوڕێکەی بکە، چونکە هاوڕێ شوێن هاوڕێکەی دەکەوێ و ئیقتدای پێدەکات.

حدثنا أبو عقيل أنس بن السلم، قال: حدثنا مُعلَّل بن نُفيل، قال: حدثنا عبيدالله ابن عمرو، عن أيوب، عن أبي قِلابة، عن أبي الدرداء، قال: من فقه الرجل: مَمشاه، ومَدخله، ومخرجه.

ثم قال أبو قِلابة: قاتل الله الشاعير حين قال:

عن المَرءِ لا تسأل وأبصر قرينه .. فإن القرينَ بالمُقارِنِ مُقتدي.

كتاب السنة للخلال | ٢٣٨٢ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٠٨

**الأصمعي عبدالملک بن قريب** دەڵێ: قەت نەم بينيوە بەيتە شيعر هەبێ لە حديث بچێ وەک قەولی عدی: لە کەسێک مەپرسە دەربارەی دينی بەڵکو سەيری هاوڕێکەی بکە، چونکە هاوڕێ بە هاوڕێ هەڵدەسەنگێنرێ.

حدثنا أبو عبدالله محمد بن يعقوب المتَّوثي -بالبصرة- قال: حدثنا أبو بكر البلقي، قال: حدثنا أبو حاتم سهل بن محمد، قال: حدثنا الأصمعي قال: لم أَرَ بيتاً قط أشبه بالسُنة من قول عَدي :

عن المرءِ لا تسأل وأبصِر قرينه .. فإن القَرينَ بالمُقارنِ مُقتدى.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٠٩

وتەکەی الأصمعي "ئەم بینیوە بەیتە شیعر لە حدیث بچێ" مەبەستی ئەوەیە ئەم قەولە هەمان واتای ئەم حەدیثەی هەیە و لەم حدیثەوە وەرگیراوە: « ئافرەت و پیاو لەسەر دینی هاوڕێکەیانن، کەواتە هەریەک لە ئێوە با سەیر بکات بزانێ کێ دەکاتە هاوڕێی خۆی ».

حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ وَأَبُو دَاوُدَ، قَالَا: حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي مُوسَى بْنُ وَرْدَانَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: « **الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ** ».

سنن أبي داود ا ٤٨٣٣ سنن الترمذي ا ٢٣٧٨ مسند أحمد ا ٨٠٢٨ كتاب السنة للخلال ا ٢٣٧٩ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٣٨٨

**مجاهد** لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا ﴾. دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ نەهی کردووە ئینسان لەگەڵ ئەو کەسانەدا دابنیشێ کە گاڵتە دەکەن بە ئایەتەکانی قورئان، ئیللا مەگەر بیری بچێ، وە هەرکات بیری کەوتەوە ئەوە دەبێ هەستێتەوە و جێیان بهێڵێ، ئەوەش قەولی الله ـیە ﷻ: ﴿ إِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ

عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَىٰ مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴾.

حدثنا القاسم، قال: حدثنا الحسين، قال: حدثني الحجاج، عن ابن جريج، عن مجاهد، قوله: ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا ﴾. قال: يَستهزئون بها، قال: نُهي رسول الله ﷺ أن يقعد معهم إلا أن يَنسى، فإذا ذَكَرَ فليقم، فذالک قوله: ﴿ إِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَىٰ مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾.

تفسير الطبري | **(١٠٨٧/٨)** الإبانة الكبرى لابن بطة | ٣٨٤

**أبي صالح** دەڵێ: عبدالله بن عباس رضي الله عنهما وتی: لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوو دامەنیشە، چونکە دانیشتن لەگەڵیان دڵ دەمرێنێ.

أخبرنا الفريابي، قال: حدثنا أبو تَقِي هشام بن عبدالملک الحمصي، قال: حدثنا محمد بن حرب، عن أبي سلمة سليمان بن سليم، عن أبي حصين، عن أبي صالح، عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: لا تُجالس أهل الأهواء، فإن مجالستهم مُمرضة للقلوب.

كتاب الشريعة للآجري | ١٣٣ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٠٢

**بقية بن وليد** دەڵێ: ثابت بن عجلان بۆی گێڕاینەوە، وتی: گەیشتووم بە هەریەک لە أنس بن مالک، سعيد بن مسيب، حسن البصري، سعيد بن جبير، عامر الشعبي، إبراهيم النخعي، عطاء بن أبي رباح، طاووس، مجاهد، عبدالله بن أبي مليكه، إبن شهاب الزهري، مكحول، أبا عبدالرحمن قاسم بن محمد، عطاء الخراساني، ثابت البناني، حكم بن عتبة، أيوب السختياني، حماد بن أبي سليمان، محمد بن سيرين، أبا عامر كە گەیشتووە بە أبو بكر الصديق، يزيد الرقاشي، سليمان بن موسى، هەموویان ئەمریان پێدەکردم شوێن جەماعە بکەوم، وە نەهییان لێدەکردم هاوڕێیەتی ئەهلی هەوا و ئارەزوو بکەم، بقية دەڵێ: پاشان دەستی کرد بە گریان، وە وتی: ئەی کوڕی برام، هیچ کردەوەیەک نییە هێندەی ڕۆیشتن بۆ ئەو مزگەوتە چاک بێ. واتە: مزگەوتی الباب.

أخبرنا علي بن محمد بن أحمد بن بكر، قال: حدثنا الحسن بن عثمان، قال: حدثنا يعقوب بن سفيان، قال: حدثنا عمرو بن عثمان، قال: حدثنا بقية، قال: حدثنا ثابت بن العجلان، قال: أدركت أنس بن مالك، وابن المسيب، والحسن البصري، وسعيد بن جبير، والشعبي، وإبراهيم النخعي،

وعطاء بن أبي رباح، وطاووس، ومجاهد، وعبدالله بن أبي مليكة، والزهري، ومكحول، والقاسم -أبا عبدالرحمن- وعطاء الخراساني، وثابت البناني، والحكم بن عتبة، وأيوب السختياني، وحماد، ومحمد بن سيرين، وأبا عامر -وكان قد أدرك أبا بكر الصديق- ويزيد الرقاشي، وسليمان بن موسى، كلهم يأمروني في الجماعة، وينهوني عن أصحاب الأهواء. قال بَقِيَّة: ثم بكى، وقال: يا ابن أخي، ما مِن عمل أرجا، ولا أُوثق مِن مشي إلى هذا المسجد. يعني: الباب.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٣٩ الشرح والإبانة لابن بطة ا ١٥٥

**هشام بن حسان** دەڵێ: حسن البصري و محمد بن سيرين وتيان: لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوو دامەنیشن، وە موجادەلە مەکەن لەگەڵیان، وە گوێشیان لێمەگرن.

أخبرنا أحمد، حدثنا زائدة، عن هشامٍ، عن الحسن وابن سيرين، أنهما قالا: لا تُجالسوا أصحاب الأهواء، ولا تُجادلوهم، ولا تسمعوا مِنهم.

سنن الدارمي ا ٤١٥ كتاب السنة لحرب الكرماني ا ٦٠٠ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٨٥ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٤٠ جامع بيان العلم لابن عبدالبر ا ١٨٠٣ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٧٦٦

**أبو قلابة** دەڵێ: لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوو دامەنیشن، موجادەلەش لەگەڵیان مەکەن، چونکە ئەمین نیم لێیان و ترسم هەیە بتانخەنە ناو گومڕاییەکەیان، وە ئەوەی دەربارەی ئەوان دەیزانن دایپۆشن لەسەرتان و بیشارنەوە.

أخبرنا سليمان بن حربٍ، عن حماد بن زيدٍ، عن أيوبٍ قال: قال أبو قِلابة: لا تُجالسوا أهل الأهواء، ولا تُجادلوهم، فإني لا آمنُ أن يغمسوكم في ضلالتهم، أو يلبسوا عليكم ما تعرفون.

سنن الدارمي ا ٤٠٣ كتاب القدر للفريابي ا ٣٧٠ كتاب البدع لابن وضاح ا ١٣٢ كتاب السنة للخلال ا ١٩٢٧ كتاب الشريعة للآجري ا ١١٤ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٣٩٤ كتاب أصول السنة لابن أبي زمنين ا ٢٤٣ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٤٤ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٨٣٣

**عمرو بن قيس** دەڵێ: وتراوە: لەگەڵ ئەهلی زەیغ و گومڕایی و شەک و گومان دامەنیشە، چونکە دڵت تووشی گومان و گومڕایی دەکات و لەسەر حەق لات دەدات.

حدثنا أبو بكر أحمد بن محمد السِّرِي التميمي بن أبي دارم الكوفي، قال: حدثنا ابن أبي غِيَاث، قال: حدثنا أبو سعيد، قال: حدثنا أبو خالد، عن عمرو بن قيس، قال: كان يُقال: لا تُجالس صاحب زَيغٍ، فيزيغ قلبك.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٣٩٧

**أبو عبدالله الملائي** دەڵێ: لەگەڵ ئەصحابی هەوا و ئارەزوو دامەنیشن، چونکە دڵ دەمرێنن.

حدثنا القافلائي، قال: حدثنا محمد بن إسحاق الصَّاغاني، قال: أخبرنا عِصمة، قال: حدثنا أبو عبدالله المُلائي، قال: لا تُجالسوا أصحاب الأهواء، فإنهم يمرضون القلوب.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٠٣

**حسن البصري** دەڵێ: لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوو دامەنیشن، چونکە دانیشتن لەگەڵیان دڵ دەمرێنێ.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: عن بقية بن الوليد، قال: حدثني سليمان بن سليم، عن حبيب، عن أبي الزرقاء، عن الحسن قال: لا تُجالسوا أهل الأهواء، فإن مجالستهم مُمرضةٌ للقلوب.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٠٤

**إبراهيم النخعي** دەڵێ: لەگەڵ ئەصحابی هەوا و ئارەزوو دامەنیشن، چونکە دەترسم دڵتان لەسەر حەق لابدەن و وەریبگەڕێنن.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا سليمان بن خَلَّاد أبو خَلَّاد، قال: حدثنا أبو النضر، قال: حدثنا محمد بن طلحة، عن الهُجَيْع -يعني: إبن قيس- عن إبراهيم، قال: لا تُجالسوا أصحاب الأهواء، فإني أخاف أن تَرْتَدَّ قلوبكم.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٠٥

**إبراهيم النخعي** دەڵێ: لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوو دامەنیشن، چونکە دانیشتن لەگەڵیان: نوری ئیمان لە دڵ ناهێڵێ، وە جوانی ڕوومەتتان لێدەسێنێتەوە، وە ڕق و کینە لە دڵی ئیمانداراندا دەچێنێ.

حدثنا جعفر القافُلائي، قال: حدثنا عباس الدوري، قال: حدثنا مُحاضر، عن الأعمش، قال: قال إبراهيم: لا تُجالسوا أَهل الأهواء، فإن مُجالستهم: تذهب بنور الإيمان مِنَ القلوب، وتَسلبُ محاسنَ الوجوه، وتُورثُ البغضة في قلوبِ المؤمنين.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٠٦

**عبدالله بن مبارك** دەڵێ: خاوەن بیدعه لەسەر ڕوومەتی تاریکایی هەیە، تەنانەت ئەگەر لە ڕۆژێکیشدا سی جار چەوری بکات و پاکی بکاتەوە.

أخبرنا أحمد بن محمد بن إسماعيل، قال: حدثنا محمد بن جعفر بن مسلم، قال: حدثنا أحمد بن علي بن مسلم المخرمي، قال: حدثنا أبو عمار الحسين بن حريث، عن عبدالعزيز بن أبي رِزمة، قال: قال ابن المبارك رحمه الله: صَاحِبُ البِدعَة عَلَى وَجهِهِ الظُّلمة، وإن ادَّهَّنَ في كُلِ اليَومِ ثَلاثينَ مَرَّةً.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٨٤ ذم الكلام وأهله للهروي | ١٠٢٥

لای **اللالكائي** لە جیاتی وشەی « الظُّلمة » وشەی « غُبَار » هاتووە.

**عبدالصمد بن يزيد** دەڵێ: بیستم فضيل بن عياض دەیوت: ئەگەر کەسێک هات بۆ لای یەکێک لە ئێوە، ڕاوێژی پێکردن ئەویش ئاڕاستەی کرد و ناردیە لای موبتەدعێک، ئەوە غەش و فێڵی لە ئیسلام کردووە، ئاگاداربن لە چوونە لای ئەهلی بیدەع، چونکە ئەوانە ڕێگرن لە حەق، وە لە حەق لاتان دەدەن.

أخبرنا الحسن، قال: أخبرنا أحمد بن حمدان، قال: حدثنا أحمد بن الحسن، قال: حدثنا عبدالصمد، قال: سمعت فضيل بن عياض، يقول: من أتاه رجل فشاوره فَدَلّه على مبتدع، فقد غَشَّ الإسلام، واحذروا الدخول على أصحاب البدع، فإنهم يصدون عن الحق.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٦١

**فضيل بن عياض** دەڵێ: گەیشتووم بە چاکترینی خەڵکی هەموویان ئەهلی سوننە بوون، وە ڕێگرییان دەکرد لە هاوڕێیەتی ئەهلی بیدەع.

أخبرنا الحسن بن عثمان، قال: أخبرنا أحمد بن حمدان، قال: حدثنا أحمد بن الحسن، قال: حدثنا عبدالصمد، قال: سمعت الفضيل بن عياض،

يقول: أدركت خيار الناس كلهم أصحاب السنة، وينهون عن أصحاب البدع.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٦٧

**فضيل بن عياض** دەڵێ: ئیماندار دەبێ لە مەواقفی شوبهە بوەستێ و خۆی بپارێزێ، هەرکەسێک چوویە لای ئەصحابی بیدەع ئەوە هیچ حورمەتێکی نییە، وە ئەگەر الله ﷻ عەبدێکی خۆشویست تەوفیقی دەدات بۆ عەمەلی صاڵح، خۆتان نزیک بکەنەوە لە الله ﷻ بە خۆشویستنی هەژاران.

أخبرنا الحسن بن عثمان، قال: أخبرنا أحمد بن حمدان، قال: حدثنا أحمد بن الحسن، قال: حدثنا عبدالصمد مردوية، قال: سمعت الفضيل بن عياض، يقول: المؤمن يقف عند الشبهة، ومَن دخل على صاحب بدعة فليست له حُرمة، وإذا أحبَ الله عبدًا وفقه لعمل صالح، فتقربوا إلى الله بحب المساكين.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٨٢

قتادة لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ ﴾. دەڵێ: بیدعە دامەهێنن و لەگەڵ ئەهلی بیدەع دامەنیشن.

حدثنا أبو محمد الحسن بن علي بن زيد العسكري، قال: حدثنا علي بن سهل الرملي، قال: حدثنا الوليد بن مسلم، عن خُليد بن دعلج، عن قتادة في قوله: ﴿ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ ﴾. قال: لا تَبْتَدِعوا ، ولا تُجالسوا مُبتَدعًا.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤١١

طلحة بن عمرو دەڵێ: لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوو دامەنیشن، چونکە پیس و چەپەڵن وەک پیسی نەخۆشییەک کە دەگوازرێتەوە.

حدثنا أبو بكر، حدثنا يعلى، عن طلحة بن عمرو، قال: لا تُجالسوا أهل الأهواء، فَإِنَّ لهم عُرَّةً كَعُرَّة الجَرَبِ.

كتاب السنة لحرب الكرماني | ٥٩٩ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤١٣ ذم الكلام وأهله للهروي | ١٠٤٥

ئەم ئەثەرە لای إبن بطة لە قەولی مجاهد هاتووە و ڕیوایەتی کردووە.

**محمد بن واسع** دەڵێ: صفوان کوڕی محرز ـم بینی لە تەنیشتیەوە کۆمەڵێک کەس موجادەلەیان دەکرد، ئەویش هەستایە سەرپێ و جلەکانی تەکاند، ئەنجا وتی: ئێوە نەخۆشی و دەردی گوازراوەن.

حدثنا أبو بكر ابن أبي شيبة، حدثنا الفضل، عن حماد بن زيد، عن محمد بن واسع، قال: رأيت صفوان بن محرز المازني -وإلى جنبه قوم يتجادلون- فقام ونَفَضَ ثيابه، وقال: إنما أنتم جَرَبٌ.

كتاب القدر للفريابي | ٣٨٢ كتاب الشريعة للآجري | ١٢٨ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٢٢

**مصعب بن سعد** دەڵێ: لای مەفتون کەسی خاوەن فیتنە دامەنیشە، چونکە لەم دوو حاڵەتە ئیللا توشی دانەیەکیانت دەکات: توشی فیتنەت دەکات و شوێنی دەکەوی، یاخود ئازارت دەدات پێش ئەوەی لێی جیاببیتەوە.

حدثنا القافُلائي، قال: حدثنا محمد بن إسحاق، قال: حدثني يعلى بن عبيد، قال: حدثنا سفيان بن دينار التَّمار، قال: سمعت مصعب بن سعد،

يقول: لا تُجالس مفتونًا، فإنه لن يخطئك منه إحدى اثنتين: إمَّا أن يفتنك فتُتَابعه، وإِمَّا أن يؤذيك قبل أن تُفارقه.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤١٦

**حماد بن زيد** دەڵێ: یونس بن عبید پێی وتین: ئامۆژگاریتان دەکەم بە سێ شت، لێمی وەربگرن گەر ژیام یاخود مردم: گوێ مەگرە بۆ ئەهلی هەوا و ئارەزوو، وە مەچۆرە خەلوە لەگەڵ ئافرەت کە مەحرەمت نەبێ تەنانەت ئەگەر بتەوێ فێری قورئان خوێندنی بکەیت، وە مەچۆرە مەجلسی هیچ ئەمیرێک، تەنانەت ئەگەر بتەوێ ئامۆژگاری بکەیت.

حدثنا أبو محمد عبيدالله بن عبدالرحمن بن محمد بن عيسى السُّكري، قال: حدثنا زكريا بن يحيى بن خلاد المنقري، قال: حدثنا الأصمعي، قال: حدثنا حماد بن زيد، قال لنا يونس بن عبيد: أُوصيكم بثلاث، خُذوها عني حَييتُ أو مُتُّ: لا تُمكِّن سمعك مِن صاحب هوًى، ولا تَخُل بامرأة ليست لك بمحرم، ولو أن تقرأ عليها القرآن، ولا تدخُلنَّ على أمير، ولو أن تَعظِه.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤١٨

**إسماعيل بن عبيدالله** دەڵێ: لای خاوەن بیدعە دامەنیشە، چونکە دڵت دەمرێنێ، وە لای مەفتون دامەنیشە، چونکە قەول و مەنهەجی خۆی بە حوجە دەزانێ و چاک فێری بووە و وازی لێناهێنێ، وە بترسە لەوەی تووشت بکات.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا عبدالرحمن بن يحيى بن إسماعيل، قال: حدثنا الهيثم بن عمران، قال: سمعت إسماعيل بن عبيدالله، يقول: لا تُجالس ذا بِدعة، فيُمرض قلبَك، ولا تُجالس مفتونًا، فإنه مُلقَّنٌ حُجَّته.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٢٢

**عبدالرحمن ابن أبي حاتم** دەڵێ: باوکم و أبو زرعة ڕێگریان دەکرد لە دانیشتن لەگەڵ ئەهلی کەلام و سەیرکردنی کتێبی ئەهلی کەلام، وە دەیانوت: خاوەنی کەلام قەت سەرکەوتوو نابێ، وە هەجری ئەهلی بیدەع و ئەهلی زەیغیان دەکرد، وە زۆر توند بوون لەسەریان هەتا ئەوپەڕی توندی، وە ئینکاری و ڕێگریان دەکرد کتێب بنوسرێ لەسەر ڕەئی و دوور لە ئاثاری سەلەف، وە ئەمریان دەکرد بە هەجر کردنی ئەو کەسانە.

أخبرنا غالب بن علي بن محمد بن إبراهيم الرازي، ومحمد بن الحسين بن المرزبان الأزرق الأردستاني -قَدِمَ هراة حفيد جعفر بن فناكي ابن ابنته- قالا: سمعنا جعفر بن عبدالله بن يعقوب، يقول: سمعت عبدالرحمن بن أبي حاتم، يقول: كان أبي وأبو زرعة ينهيان عن مجالسة أهل الكلام والنظر في كتب المتكلمين، ويقولان: لا يفلح صاحب الكلام أبدًا، ويهجران أهل الزيغ والبدع، ويغلظان فيه أَشَدَّ التغليظ، وينكران وضع الكتب بالرأي بغير آثار، ويأمران بهجرانهم.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٢٢٨ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٣٢٢ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٢٣٨

**أبا يعقوب ابن زوران** دەڵێ: وەڵامی پرسیارێکم دایەوە لە بابەتی کەلام، پاشان گەڕامەوە بۆ ماڵەوە هیچ شتێک لە دڵمدا نەمابوو لەو هەموو عیلمەی کە الله ﷻ دەیبەخشێ بە ئیمانداران، هەتا هەستامەوە خۆم شۆری و چوومە سوجدە و پاڕامەوە و تەوبەم کرد و گریام هەتا بۆی گەڕاندمەوە.

سمعت أحمد بن حمزة، يقول: سمعت أبا يعقوب ابن زُوران الفقيه الفارسي المُجاوِر ومفتي الحرم بمكة، يقول: أُجَبتُ عن مسألة في الكلام،

فرجعت إلى بيتي وما في قلبي مِن كل ما مَنَّ الله بِهِ على المؤمنين مِن شيء، حتى قمت، فاغتلست، وسَجَدتُ، وتَضَرعتُ، وتُبتُ، وبَكَيتُ حتى رُدَّ عَلَيَّ.

ذم الكلام وأهله للهروي | ١٢٨٤

**أحمد بن أبي نصر المالِيني** دەڵێ: لەگەڵ کۆمەڵێک هاوڕێم چووینە مزگەوتی عمرو بن العاص رضي الله عنه لە میصر، کاتێک دانیشتین، شێخێک هات وتی: ئێوەی ئەهلی خۆراسان ئەهلی سوننەن، بەڵام ئەمە شوێنی ئەشاعیرەیە، هەستن جێی بهێڵن.

سمعت أحمد بن أبي نصر المالِيني، يقول: دخلتُ الجامع عمرو بن العاص رضي الله عنه بمِصرَ في نَفَرٍ من أصحابي، فلما جَلَسنا، جاء شَيْخٌ فقال: أنتم أهل خُراسان أهل سُنَّةٍ، وهذا هو مواضع الأشعرية، فقوموا.

ذم الكلام وأهله للهروي | ١٣٣٢

**أبو القاسم الجنيد** دەڵێ: کەمترینی خراپەی کەلام ئەوەیە، هەیبەت و شکۆی ڕەب العالمین لە دڵتدا نامێنێ، دڵ ئەگەر خاڵی ببێ لە هەبوونی هەیبەتی الله ﷻ ئەوە خاڵی بووە لە ئیمان.

قال أبو القاسم الجنيد: أقَل ما في الكلام، سقوط هيبة رب العالمين مِنَ القلب، والقلب إذا عري مِنَ الهيبة مِنَ الله ﷻ فقد عري الإيمان.

الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٢٣٥

**سهل بن عبدالله** دەڵێ: قسە كردن لە بابەتی کەلامی لە دیندا بۆ ئەهلی سوننە بیدعەیە، کەمترین و بچوکترین بیدعە بوونی ئەوەیە واز لە طەلەبی عیلم دەهێنی، وە سزای کەلام لە دیندا سێ شتی عاجلن:

**یەکەم:** ئیمانی لاواز دەبێ.

**دووەم:** لە دڵیدا هیچ جێگایەک نامێنێ بۆ ئەمر و نەهی الله ﷻ.

**سێهەم:** حوکمی کوفر دەدات بەسەر کەسانێکدا لە هەمان کاتدا بە یەقینی دەزانێ لە خۆی زیاتر لە الله ﷻ دەترسن و وەرع ترن، وە لای الله ﷻ خێردارترن.

قال سهل بن عبدالله: الكلام في الدين لأهل السنة بدعة، وأدنى البدعة أن يقف عن طلب العلم، وعقوبة الكلام في الدين ثلاثة أشياء عاجلة :

أول ذالک: أنه يَرِق الإيمان.

والثاني: لا يرى لأمر الله ونهيه في قلبه موضعًا.

والثالث: يشهد بالكفر على مَن يعلم يقينًا أنه أتقى لله مِنه وأورع وأخيَر عندالله.

الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٢٤٤

وە کاتێک أبو بكر الأعين وەفاتی کرد، **أحمد بن حنبل** وتی: من ئیرەیی پێدەبەم، مرد بێجگە لە حدیث هیچی تری نەدەزانی، خاوەنی کەلام نەبوو، بەڵکو خاوەنی حدیث بوو تەنها حدیثی دەنوسی و ڕیوایەت دەکرد.

وقال الإمام أحمد لما مات أبو بكر الأعين: إني لأغبطه، مات ولم يعرف إلا الحديث، ولم يكن صاحب الكلام، إنما كان يكتب الحديث.

الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٢٥٤

**قاضي أبو يوسف** دەڵێ: شارەزابوون بە کەلام جەهلە، وە جاهل بوون بە کەلام عیلمە.

حدثني أبو صالح، قال: حدثنا أبو الأحوَص، قال: حدثنا بشر بن الوليد الكِندي، قال: سمعت أبا يوسف، يقول: العلم بالكلام جهلُ، والجهل بالكلام هو العلم.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٩٢

**أحمد بن الوزير قاضي** پرسیاری کرد لە أبو عمر الضرير: کەسێک خۆی فێری هەندێک لە کەلام بکات بە مەبەستی ڕەتدانەوەی ئەهلی جەهل؟ وتی: کەلام هەمووی جەهلە، خۆت فێری جەهل مەکە، تۆ چەندە شارەزا بی بە جەهل، ئەوە هێندە جاهلی بە عیلم.

وقال أحمد بن الوزير القاضي، لأبي عمر الضرير: الرَّجُل يتعلم شيئًا مِنَ الكلام يَرد به على أهل الجهل؟ فقال: الكلام كله جهل، لا تتعلم الجهل، فإنک كلما كنت بالجهل أعلم، كنت بالعلم أجهل.

الحجة على تارک المحجة لأبي الفتح المقدسي | ٢٣٧

**مفضل بن مهلهل** دەڵێ: ئەگەر لە مەجلسی خاوەن بیدعەیەک دابنیشی و ئەویش ڕاستەوخۆ بیدعەکەی خۆیت پێبناسێنێ و بانگت بکات بۆی، ئەوە حەزەری لێدەکەیت و لێی ڕادەکەی، بەڵام لێزانانە هەوڵت لەگەڵ

دەدات سەرەتا حدیثەکانی ئەهلی سوننەت بۆ دەخوێنێتەوە، پاشان بیدعەکەیت پێدەناسێنێ، ئیتر لەوانەیە بچێتە دڵتەوە، ئەوکات چۆن و چ کاتێک لە دڵت دەردەچێ؟!

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا الحسن بن الربيع، قال: حدثنا نوفل بن مُطهر، عن مُفضَّل بن مُهَلهَل، قال: لو كان صاحب البدعة إذا جلست إليه رَماك ببدعته حذرتَه، وفررتَ منه، ولكنَّه يُحَدِّثُك بأحاديث السُّنةِ في بدوِ مجلسه، ثم يُدخلُ عليك بدعته، فلعلَّها تلزمُ قلبك، فمتى تخرجُ من القلب؟!

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٢٥

حسن البصري دەڵێ: گوێت مەکەوە بۆ بیستنی وتەی ئەهلی هەوا و ئارەزوو، چونکە دڵت نەخۆش دەخات، وە وەڵامی داوای هیچ ئەمیرێک مەدەرەوە تەنانەت ئەگەر داوای لێکردی بچیتە لای بۆ ئەوەی سورەتێک لە قورئانی بۆ بخوێنی، چونکە لە لایەوە بە چاکە دەربازت نابێ ئیللا تووشی شەڕت دەکات.

حدثنا أبو الحسن أحمد بن القاسم الشَّبَي، قال: حدثنا إسحاق بن إبراهيم بن عَبَّاد الدبري، قال: حدثنا عبدالرزاق، عن معمر، عن مُرَّة،

سمع الحسن يقول: لا تُمَكِّن أُذُنيك من صاحب هوًى، فيُمرض قلبك، ولا تُجِيبَنَّ أميرًا، وإن دعاكَ لتقرأ عنده سورةً من القرآن، فإنك لا تخرج من عنده إلَّا بِشَرٍّ مما دخلت.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٢٧

**أسماء بن عبيد** دەڵێ: دوو پیاوی ئەهلی هەوا و ئارەزوو هاتنە لای محمد بن سيرين، پێیان وت: ئەی باوکی بەکر حدیثێکت بۆ بگێڕینەوە؟ وتی: نەخێر. وتیان: ئایەتێکت لە کتابی الله بۆ دەخوێنینەوە؟ وتی: نەخێر. هەستن جێم بهێڵن یاخود من هەستم جێتان بهێڵم. دوو پیاوەکە هەستان چوونە دەرەوە، هەندێک لەوانەی ئامادەبوون وتیان: ئەی باوکی بکر چی دەبوو ئایەتێکی لە کتێبی الله ﷻ بخوێندایەتەوە بۆت؟ وتی: ترسام ئایەتێکم بۆ بخوێنێننەوە، تەحریفی بکەن حوکمەکەی بگۆڕن، وە لە دڵمدا جێگیر ببێ.

أخبرنا سعيد بن عامر: عن أسماء بن عُبيد، قال: دخل رجلان مِن أصحاب الأهواء على ابن سيرين، فقالا: يا أبا بكر نُحَدِّثُك بحديث؟ قال: لا. قالا: فنقرأ عليك آيةً من كتابِ الله؟ قال: لا. لَتَقومَانِّ عَنِّي أو لَأَقومَنَّ. قال: فَخَرَجا، فقال بعض القوم: يا أبا بكرٍ، وما كان عليك أن يقرأ عليك آيةً

من كتاب الله تعالى؟ قال: إني خشيت أن يقرأ عَلَيَّ آيةً، فَيُحَرِّفَنِها، فَيَقِرُّ ذالک في قلبي.

سنن الدارمي ׀ ٤٠٩ كتاب القدر للفريابي ׀ ٣٧٣ كتاب الشريعة للآجري ׀ ١٢١ الإبانة الكبرى لابن بطة ׀ ٤٢٩ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ׀ ٢٤٢

**هشام بن حسان** دەڵێ: پیاوێک بە محمد بن سيرين ـی وت: فڵانە کەس دەیەوێ بێت بۆ لات هیچ قسەیەکیش نەکات. إبن سيرين وتی: بڵێ بە فڵان با نەیێت، چونکە دڵی بەنی ئادەم لاوازە، وە من دەترسم کەلیمەیێکی لێببیستم، تەئسیری هەبێ لەسەرم و دڵم نەگەڕێتەوە سەر حاڵی خۆی.

حدثنا إسماعيل بن محمد الصفار، قال: حدثنا عبدالله بن أيوب المُخرِّمي، قال: حدثنا عبدالرحيم بن هارون، قال: حدثنا هشام بن حسان، قال: قال رجلُ لابن سيرين إن فلاناً يُريد أن يأتيک ولا يتكلم بشيء. قال: قل لفلان: لا يأتيني، فإن قلبَ ابن آدم ضعيف، وإني أخاف أن أسمع منه كَلِمَةً، فلا يرجع قلبي إلى ما كان.

الإبانة الكبرى لابن بطة ׀ ٤٣٠

**معمر** دەڵێ: إبن طاووس دانیشتبوو، پیاوێکی عەقیدە موعتەزیلی هات دەستیکرد بە قسەکردن، إبن طاووس پەنجەکانی کردنە گوێی، هەروەها بە کوڕەکەشی وت: کوڕم تۆش پەنجەت بە توندی بخەرە گوێیەکانت، وە گوێ مەگرە بۆ هیچ شتێک لە قسەکانی. معمر دەڵێ: واتە دڵ لاوازە.

حدثنا إسماعيل بن محمد أبو علي الصَّفار، قال: حدثنا أحمد بن منصور الرمادي، قال: حدثنا عبدالرزاق، قال: أخبرنا معمر، قال: كان ابن طاووس جالسًا، فجاء رجل مِنَ المعتزلة، فجعل يتكلم، فأدخل ابن طاووس إصبعيه في أُذنيه، وقال لابنه: يا بُنيَّ أَدخل إصبعك في أُذنيك، واشدد، ولا تسمع مِن كلامه شيئًا. قال معمر: يعني أن القلب ضعيف.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٣١ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٤٨ ذم الكلام وأهله للهروي | ٧٧٢

**مجاهد** دەڵێ: بە عبدالله بن عمر رضي الله عنهما وترا: نجدة ی حەروری ئەمە و ئەوە دەڵێ. إبن عمر هەوڵیدا قسەکانی نەبیستێ پێی ناخۆش بوو شتێک لەو قسانە بچێتە دڵیەوە.

حدثنا الحسن بن عثمان، قال: أخبرني أحمد بن الحسن، قال: حدثنا سليمان بن الأشعث، قال: حدثنا محمود بن خالد، قال: حدثنا الفريابي، عن سفيان، عن الربيع، عن قيس: عن مجاهد، قال: قيل لابن عمر: إِنَّ نَجدَة يقول: كذا وكذا. فجعل لا يسمع منه كراهية أن يقع في قلبه شيء.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ١٩٩

**محمد بن عبدالرحمن** دەڵێ: أبا منصور الحاكم ـم بینی لە خزمەتیدا باسی شتێک لە کەلام کرا، ئەویش هەردوو پەنجەی کردە ناو گوێی.

سمعت محمد بن عبدالرحمن الدَّباس العدل، يقول: رأيت أبا منصور الحاكِم ذُكِرَ بين يديه شيء مِنَ الكلام، فأدخل أصبعيه في أُذنيه.

ذم الكلام وأهله للهروي | ١٣٠٨

**عبدالرزاق** دەڵێ: إبراهيم بن محمد پێی وتم: وای دەبینم لای ئێوە موعتەزیلە زۆرن؟ وتم: بەڵێ، ئەوان پێیان وایە تۆش یەکێکی لەوان. وتی: ئا وەرە ئەو دوکانە هەتا قسەت لەگەڵ بکەم؟ وتم: نەخێر. وتی: بۆ؟ وتم: چونکە دڵ لاوازە، حەق و دینیش ئەوە نییە هەرکەسێک بەهێزتر بوو سەرکەوتووە.

حدثنا إسماعيل بن محمد الصفار، قال: حدثنا أحمد بن منصور الرمادي، قال: حدثنا عبدالرزاق: قال لي إبراهيم بن محمد بن أبي يحيى: أرى معتزلة عندكم كثيراً؟ قلت: نعم، وهُم يزعمون أنَّك منهم. قال: أفلا تدخل معي هذا الحانوت حتى أكلمك؟ قلت: لا. قال: لِمَ؟ قلت: لأن القلب ضعيف، والدِّين ليس لمن غَلَب.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٣٢ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٤٩ ذم الكلام وأهله للهروي | ٧٧٣

**ربيع بن خثيم** دەڵێ: طاووس دانیشتبوو لەگەڵ طلق بن حبيب، پیاوێکی ئەهلی هەوا و ئارەزوو هاتە لایان، وتی: ئیزنم دەدەن دابنیشم؟ طاووس وتی: ئەگەر تۆ دابنیشی ئێمە هەڵدەستینەوە ئێرە جێدەهێڵین. پیاوەکە بەسەر سوڕمانەوە وتی: الله لێت خۆشبێ ئەی باوکی عبدالرحمن! طاووس وتی: ئیتر بەو جۆرەیە، والله ئەگەر تۆ دابنیشی ئەوە ئێمە هەڵدەستینەوە. کابراکە ڕۆیشت دانەنیشت.

حدثنا جعفر القافُلائي، قال: حدثنا محمد بن إسحاق الصَّاغاني، قال: أخبرنا أحمد بن محمد الزُرَقي، قال: حدثنا مسلم بن خالد، عن ابن خُثيم، أن طاووسًا، كان جالسًا هو وطلق بن حبيب، فجاءهما رجلُ مِن أهل

الأهواء، فقال: أتأذن لي أن أجلس، فقال له طاووس: إن جلست قُمنا. فقال: يغفر الله لک يا أبا عبدالرحمن! فقال: هو ذاک، إن جلست والله قُمنا. فانصرف الرجل.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٣٤

وتم: ئێستا بیهێننە پێش چاوتان زۆربەی زۆری مەلاکان و ئەوانەشی خۆیان بە دەعوەکار و شوێنکەوتەی سەلەف دەزانن لەگەڵ هەموو جۆرە کەسانێکی باغی و تافە و فاسق و فاجر دادەنیشن و دەچنە مەجلس وماڵی یەکتری، وە بە شتێکی ئاساییشی دەبینن! یاخود دەرگای ماڵیان بۆ هەموو جۆرە ئینسانێکی بێدین و ساقط دەکەنەوە و بە دەمیانەوە پێدەکەنن!

سلام بن أبي مطيع دەڵێ: ئێمە لەگەڵ أيوب السختياني لە مسجد الحرام دانیشتبووین، أبو حنيفة دەرکەوت و بەرەو ڕوومان دەهات، کاتێک أيوب ئەوی بینی وتی: هەستن، چۆڵی بکەن، با دەرد و نەخۆشیەکەیمان توش نەکات، ئیتر هەستاینەوە و چۆڵمان کرد.

حدثنا القافُلائي، قال: حدثنا محمد بن إسحاق الصَّاغاني، قال: حدثنا سعيد بن عامر، قال: حدثنا سلام بن مطيع، قال: كنا جلوسًا في المسجد

الحرام، ومعنا أيوب، فأقبل أبو حنيفة، فلما رآه أيوب، قال: قوموا، فَتَفَرَّقوا لا يَعُرُّنا بجربه، قال: فقُمنا، فتفرَّقنا.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٣٥ تاريخ بغداد للخطيب | **(٣٩٧/١٣)**

**إبن شوذب** دەڵێ: عقيل بن طلحة پێی وتم: ئايا گەيشتووی بە عمرو بن عبيد بينيوتە؟ وتم: نەخێر. وتی: پێی مەگە و مەيبينە، چونكە ئەمين نيم لێت ترسم هەيە تووشت بكات. عمرو بن عبيد عەقيدەی موعتەزيلەی هەبوو.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا أحمد بن هاشم الرملي، قال: حدثنا ضمرة، عن ابن شوذب، قال: قال لي عَقيل بن طلحة -وكانت لطلحة صُحبة-: هل لقيت عمرو بن عبيد؟ قلت له: لا. قال: فلا تلقه، لست آمنه عليک. وكان عمرو بن عبيد يرى رأي الإعتزال.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٤٠

**عبدالرحمن بن مهدي** دەڵێ: چووم بۆ لای مالک بن أنس پياوێک لەوێ بوو پرسياری لێدەكرد دەربارەی قورئان و قەدەر، مالک وتی: لەوانەيە تۆ لە هاوەڵانی عمرو بن عبيد بی، لەعنەتی الله لە عمرو بێ،

ئەو بوو ئەم بیدعەی کەلامەی داهێنا، ئەگەر کەلام عیلم بوایە ئەوە صەحابە رضي الله عنهم لەگەڵ تابعین قسەیان تێدا دەکرد هەروەک چۆن قسەیان لە ئەحکام و شەرائع کردووە، بەڵام باتڵێکە دەلالەت لە باتڵ دەکات.

وقال عبدالرحمن بن مهدي: دخلت على مالك بن أنس وعنده رَجُل يسأله عن القرآن والقَدَر، فقال: لعلَّكَ مِن أصحاب عمرو بن عبيد، لعن الله عمرًا، فإنه ابتدعَ هذه البدعة مِنَ الكلام، ولو كان الكلام عِلمًا، لتكلم به الصحابة رضي الله عنهم والتابعون، كما تكلموا في الأحكام والشرائع، ولكنه باطل يدل على باطل.

الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٢١٤

**ربيع بن سليمان** دەڵێ: بیستم شافعي دەیوت: ئەگەر هاتوو پیاوێک وەسیەت بکات دوای خۆی کتێبەکانی بدرێ بە شەخصێک، وە لە ناو کتێبەکاندا کتێبی ئەهلی کەلام هەبێ، ئەوە ناخرێتە ناو وەسیەتەکە، چونکە کتێبی کەلام بە عیلم دانانرێ.

أخبرني طيب بن أحمد، أخبرنا محمد بن الحسين، سمعت إسماعيل بن محمد بن حمدان الفقيه، عن الربيع.

وسمعت محمد بن أحمد بن محمد بن عبدالله المصعبي الفقيه، يقول: سمعت بعض الفقهاء البخارية -بنيسابور- يقول: سمعت إبراهيم بن إسماعيل بن محمد الوبري، يقول: سمعت أبا بكر محمد ابن عبدالله الأودي، يقول: سمعت عبدالمؤمن بن خلف بن معقل، يقول: سمعت الربيع، يقول: سمعت الشافعي، يقول في كتاب الوصايا: لو أَنَّ رَجُلًا أوصى بكتبه مِنَ العلم لآخر، وكان فيها كتب الكلام، لا تدخل في الوصية، لأنه ليست مِن العلم.

ذم الكلام وأهله للهروي | ١١٤٨ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي | ٢١٣

**محل بن محرز الضبي** دەڵێ: من و مغيرة چووین بۆ لای إبراهيم النخعي، وە پیاوێکی تریشمان لەگەڵ بوو، هەندێک لە قەولی ئەهلی بیدەعمان بۆی باسکرد، وتی: قسەیان لەگەڵ مەکەن، لەگەڵیان دامەنیشن.

حدثنا أبو القاسم، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا أبو نعيم الفضل بن دُكين، قال: حدثنا مُحِلٌّ، قال: دخلت على إبراهيم أنا والمغيرة، ومعنا رجل آخر، فذكرنا له من قولهم، فقال: لا تُكلموهم، ولا تُجالسوهم.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٤١

**یزيد بن شريح** دەڵێ: أبو إدريس الخولاني وتی: أبو جميلة باوەڕی بە قەدەر نییە لەگەڵی دامەنیشن.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا سلمة بن شبيب، قال: حدثنا مروان -يعني: الطاطَري- قال: حدثنا ابن عياش، قال: حدثني أبو بكر بن أبي مريم، عن يزيد بن شريح، أَنَّ أبا إدريس الخولاني، قال: إنَّ أبا جميلة لا يؤمن بالقدر فلا تُجالسوه.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٤٢

**يونس بن حلبس** دەڵێ: أبو إدريس الخولاني پیاوێکی بینی قسەی لە قەدەر دەکرد، هەستایەوە بۆی قاچی خستە سەر سکی یاخود شەقێکی هەڵدایە سکی، پاشان وتی: فلان باوەڕی نییە بە قەدەر، لەگەڵی دامەنیشن. ئیتر ئەو کەسە دیمەشقی جێهێشت چوو بۆ شاری حمص.

حدثنا أبو القاسم، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا سلمة بن شبيب، قال: حدثنا مروان بن محمد، قال: حدثنا سليمان بن عُتبة، قال: حدثني يونس بن حَلبس، عن أبي إدريس الخولاني، أنه رأى رجُلًا يتكلم في

القدر، فقام إليه فوطِئ بطنه، ثم قال: إنَّ فلانًا لا يؤمن بالقدر، فلا تُجالسوه. فخرجَ الرَّجل مِن دمشق إلى حمص.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٤٣

**أيوب السختياني** دەڵێ: سعيد بن جبير بينيمى لەگەڵ طلق بن حبيب دانيشتبووم، پێی وتم: ئەوە دەتبينم لەگەڵ طلق بن حبيب دانيشتووی؟! لەگەڵی دامەنيشە.

أخبرنا سليمان بن حَربٍ، حدثنا حماد بن زَيدٍ، عن أيوبَ، قال: رآني سعيد بن جُبَير جَلَستُ إلى طَلقِ بن حبيبٍ، فقال لي: أَلَم أَرَكَ جَلَستَ إلى طَلقِ بن حبيبٍ؟ لا تُجالِسَنَّه.

سنن الدارمي | ٤٠٤ كتاب السنة لعبدالله | ٦١١ كتاب السنة للخلال | ١٥٢٥ الإبانة الكبرى لابن بطة | ١٣٢٠ شرح أُصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ١٨١٠ ذم الكلام وأهله للهروي | ٧٩٢

ئەم ئەثەرە لای **عبدالله** بەم لەفظە هاتووە: قال سعيد بن جبير غير سائلةِ ولا ذاكرًا ذاكَ له: لا تُجالس طَلقًا، يعني: أنه كان يرى رأي الْمُرجئة.

لای **الخلال** ـیش بەم لەفظە هاتووە: قال لي سعيد بن جبير غير سائلةِ ولا ذاكرًا له ذالكَ : لا تُجالس طَلقًا.

وە لای **إبن بطة** بەم لەفظە هاتووە: قال لي سعيد بن جبير: ألم أراك مع طَلقٍ؟ قال: قلت: بلى، فما له؟ قال: لا تجالسه، فإنه مُرجئ. قال: أيوب: وما شاورته في ذالك، ولكن يحق للمسلم إذ رأى من أخيه ما يكره أن يأمره وينهاه.

**أبى حمزة** دەڵێ: پرسیار کرا لە عامر الشعبي دەربارەی مەسئەلەیەک، وتی: لەگەڵ ئەهلی قیاس دامەنیشە، چونکە وەک ئەوانت لێدێ حەرام حەڵاڵ دەکەی، وە حەڵاڵ حەرام دەکەی.

حدثنا أبو القاسم، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا علي بن عبدالحميد المعْني، قال: حدثنا سليمان بن المغيرة، عن أبي حمزة، قال: سُئِل الشعبي عن مسألة. فقال: لا تُجالس أصحاب القياس، فتُحِلَّ حرامًا، أو تُحرِّمَ حلالًا.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٤٥

**الزبرقان** دەڵێ: أبو وائل نەهی لێکردم دابنیشم لەگەڵ ئەهلی: وای دەبینم وای دەبینم.

حدثنا أبو القاسم، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا عبدالله بن محمد بن أبي شيبة ومحمد بن أبان -واللفظ لعبدالله- قال: حدثنا عبدة بن سليمان، عن الزِّبَرقان، قال: نهاني أبو وائل أن أجالس أصحاب: أرأيت أرأيت.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٤٦

مەبەست لە ئەصحابی « أرأيت أرأيت » ئەهلی ڕەئین، ئەوانەن بە پێی ڕەئی و عەقڵی خۆیان فەتوا دەدەن، نەک بە پێی بەڵگەی قورئان و حدیث و ئاثار.

**أحمد بن أبي شعيب الحراني** دەڵێ: باوکم بۆی گێڕامەوە لە خاڵیەوە فروة بن يحيى کە لەگەڵ عبدالكريم خصيف پێکەوە دادەنیشتن، سالم الأفطس لە عێراقەوە هات بۆلایان، دەستیکرد بە قسەکردن هەندێک شتی وت لە عەقیدەی ئیرجاء، هەستانەوە جێیانهێشت، دەڵێ: جاری وا هەبوو دەمدی بە تەنیا دانیشتبوو هیچ کەسێک لەگەڵی دانەدەنیشت.

حدثنا أبو القاسم، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا أحمد بن أبي شعيب الحراني، قال: أخبرني أبي، عن خاله فروة بن يحيى، أنَّه كان يُجالس عبدالكريم خُصيفًا، فقدِمَ عليهم سالم الأفطس مِنَ العراق، فتكلَّم بشيءٍ مِنَ الإرجاء، فقاموا عن مجلسهم، قال: وربُما رأيته جالسًا وحده لا يجلس إليه أحدٌ.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٤٩

**أبو الدرداء** رضي الله عنه دەڵێ: لە شارەزایی و فقهی پیاوە بزانێ لەگەڵ کێ دەگەڕێ، دەچێتە ماڵی کێ، وە لەگەڵ کێ و لە مەجلسی کێ دادەنیشێ.

حدثنا إسحاق الكاذي، قال: حدثنا عبدالله بن أحمد، قال: حدثني أبي، قال: حدثنا محمد بن عبدالرحمن الطفاوي، قال: حدثنا أيوب، عن أبي قِلابة، قال أبو الدرداء: مِن فقه الرجلِ: مَمشاه، ومَدخله، ومَجلِسه.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٨٦

**الأعمش** دەڵێ: سەلەف و پێشینەکانی ئێمە پێیان گەیشتووین، لە پیاویان نەدەپرسی حاڵی چۆنە دوای سێ شت: لەگەڵ کێ دەگەڕێ، دەچێتە ماڵی کێ، ئولفەت و خۆشەویستی بۆ خەڵکی.

حدثنا يحيى بن طالب الأنطاكي، قال: حدثنا محمد بن سهم، قال: سمعت عطاء بن مسلم الخفاف يذكر عن الأعمش، قال: كانوا لا يسألون عن الرجل بعد ثلاثٍ: ممشاه، ومدخله، وإلفه مِنَ الناس.

كتاب السنة للخلال | ٢٣٨٤ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٥٠

واتە هەرکات لەو سێ خاڵەدا حاڵی باش بوو، گەڕانی لەگەڵ ئەهلی سوننە بێ، چوونە ماڵی خەڵکی و هاتنە ماڵی لەگەڵ ئەهلی سوننە بێ، وە خۆشەویستی بۆ ئەهلی سوننە بێ و ئەهلی سوننە خۆشیان بوێ، ئەوکات حسابی ئەهلی سوننەیان بۆ کردووە، پرسیاری حاڵیان لێنەکردووە.

**يحيى بن سعيد القطان** دەڵێ: کاتێک سفيان الثوري هاتە بەصرە سەیری ئەمر و حاڵی ربیع بن صبیح ـی دەکرد بزانێ پایە و قەدری چۆنە لای خەڵکی، پرسی: عەقیدە و مەزهەبی چییە؟ وتیان: ئەهلی سوننەیە.

وتی: هاوڕێ و کەسە تایبەتەکانی کە قسە و باسیان هەیە پێکەوە کێن؟ وتیان: ئەهلی قەدەر. وتی: کەواتە قەدەرییە.

حدثنا أبو بكر المرُّوذي، قال: حدثنا أبو بكر بن خلَّاد الباهلي، قال: سمعت يحيى بن سعيد القطان، يقول: لما قَدِمَ سفيان الثوري البصرة جعل ينظر إلى أمر الربيع -يعني: ابن صبيح- وقَدرِه عند الناس، سأل: أي شيءٍ مذهبه؟ قالوا: ما مذهبهُ إلَّا السُّنة. قال: مَن بِطَانته؟ قالوا: أهلُ القدر. قال: هو قدريٌّ.

كتاب السنة للخلال ا ٢٣٨٦ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٥٢

ڕەحمەتی الله لە سەلەف بێ کاتێک شەخصێکیان دیبێ ژیانی ڕۆژانەی بەردەوام لەگەڵ ئەهلی بیدەع بووبێ، هاتن و چوون و مەجلس و کۆبونەوەی لەگەڵیان بووبێ، هێندە لەگەڵ ئەهلی باتڵ بینراوە هێندە لەگەڵ ئەهلی سوننە دیار نەبووە، هەمان حوکمی ئەو گرووپە گومڕایانەیان داوە بەسەریدا.

**الأصمعی عبدالملک بن قریب** دەڵێ: بیستم لە هەندێک فوقەهای مەدینە دەیانوت: هەرکات ڕۆحەکان بە دڵ بە یەک گەیشتن، ئەوکات هاوڕێیەتی و پەیوەندی جەستەکان پێکەوە دروست دەبێ.

حدثنا أبو بكر محمد بن القاسم بن بشَّار النحوي، قال: حدثنا أحمد بن محمد الأسدي، قال: حدثنا العباس بن الفرج الرِّياشي، قال: حدثنا الأصمعي، قال: سمعت البعض فقهاء المدينة يقول: إذا تلاحمت بالقلوب النِّسبة، تواصلت بالأبدان الصُّحبَة.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٥٣

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما تەماشای پیاوێکی کرد، ئەنجا وتی: ئەم پیاوە خۆشیدەوێم. پێی وترا: ئەی باوکی عباس، چۆن دەزانی؟ وتی: چونکە منیش خۆشمدەوێ، ڕۆحەکان کۆمەڵانێکی کۆبووەوەی جیاوازن، هەرکامیان صیفاتەکانیان وەک یەک بێ و لە یەک بچن، ئەوە پێکەوە دەبن و دەگونجێن، هەرکامیشیان هاوصیفات نەبن لەگەڵ یەک، ئەوە هەرچەندە لەم دونیاش لەیەک نزیک بن، بەڵام پێکەوە ناگونجێن.

حدثنا حفص، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا أحمد بن عبدالله بن يونس، قال: حدثنا أبو بكر -يعني: ابن عياش- عن أبي يحيى القتات، عن مجاهد، قال: نظر ابن عباس رضي الله عنهما إلى رجلٍ، فقال: إنَّ هذا لَيُحِبني. قال: قيل له: يا أبا عباس، وما يدريک؟ قال: لأني أُحبه، إنَّ الأرواح جُنودٌ مُجَندَةٌ، فما تعارف منها ائتلف، وما تناكر منها اختلف.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٣٤

**ڕەسول الله** ﷺ فەرموویەتی: « ڕۆحەکان کۆمەڵانێکی کۆبووەوەی جیاوازن، هەرکامیان صیفاتەکانیان وەک یەک بێ و لە یەک بچن، ئەوە پێکەوە دەبن و لەگەڵ یەک دەگونجێن، هەرکامیشیان هاوصیفات نەبن لەگەڵ یەک، ئەوە هەرچەندە لەم دونیاش لەیەک نزیک بن، بەڵام پێکەوە ناگونجێن ».

حدثنا أبو علي محمد يوسف البَيِّع، قال: حدثنا أبو رويق عبدالرحمن بن خلف الضبي، قال: حدثنا حجاج بن منهال، قال: حدثنا حماد بن سلمة، عن سهيل بن أبي صالح، عن أبيه، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: « الْأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ، فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ، وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ ».

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٥٦

ئەم حديثە هەریەک لە بوخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردووە، بوخاری بە ژمارە «٣٣٣٦» لە ڕێگەی عَمْرَة بنت عبدالرحمن بن أسعد بن زرارة، لە دایە عائشة رضي الله عنها هێناویەتی، وە مسلم بە ژمارە «٦٧٠٩» لە ڕێگەی سهيل بن أبي صالح ذكوان لە أبو هريرة رضي الله عنه هێناویەتی.

**عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه دەڵێ: ئەگەر هەموو خەڵکی لە دەشتێکدا کۆببنەوە هەموویان ئیماندار بن، بەڵام دوو کافریان تێدابێ، ئەوە ئەو دووانە ئولفەت و خۆشەویستیان بۆ یەک دەبێ و دەچنە لای یەک، وە ئەگەر هەموو خەڵکی لە دەشتێکدا کۆببنەوە هەموویان کافر بن، بەڵام دوو ئیمانداریان تێدابێ، ئەوە ئەو دووانە ئولفەت و خۆشەویستیان بۆ یەک دەبێ و دەچنە لای یەک.

حدثنا أبو علي محمد بن يوسف، قال: حدثنا عبدالرحمن بن خلف، قال: حدثنا حجاج بن منهال، حدثنا حماد بن سلمة، عن ثابت، أَنَّ ابن مسعود رضي الله عنه قال: لو أَنَّ الناس جُمِعوا في صعيدٍ واحدٍ كلهُم مؤمن، وفيهم كافران تَأَلَّفَ أحدهما إلى صاحبه، ولو أَنَّ الناس جُمِعوا إلى صعيدٍ واحدٍ كلهُم كافر، وفيهم مؤمنان، تَأَلَّفَ أحدهما إلى صاحبه.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٥٨

**عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه دەڵێ: ڕۆحەکان کۆمەڵانێکی کۆبووەوەی جیاوازن، لە هەوادا بە یەک دەگەن هەروەک چۆن ئەسپ هاوشێوەن و لەیەک دەچن، هەرکامیان صیفاتەکانیان وەک یەک بێ و لە یەک بچن، ئەوە پێکەوە دەبن و لەگەڵ یەک دەگونجێن، هەرکامیشیان

هاوصیفات نەبن لەگەڵ یەک، ئەوە هەرچەندە لەم دونیاش لە یەک نزیک بن، بەڵام پێکەوە ناگونجێن، ئەگەر ئیماندارێک بچێتە مزگەوتەوە، سەد کەسی تێدابێ تەنها یەک دانەیان ئیماندار بێ، ئەوە دەچێ لای ئەو کەسە ئیماندارە دادەنیشێ، وە ئەگەر مونافقێک بچێتە مزگەوتەوە، سەد کەسی تێدابێ تەنها یەک دانەیان مونافق بێ، ئەوە دەچێ لای ئەو کەسە مونافقە دادەنیشێ.

حدثنا أبو علي محمد بن يوسف، قال: حدثنا عبدالرحمن بن خلف، قال: حدثنا حجاج، قال: حدثنا عبدالعزيز بن سليم، قال: حدثنا إبراهيم الهَجْري، عن أبي الأحوص، عن عبدالله بن مسعود رضي الله عنه، قال: الأرواح جنودٌ مُجَنَّدَة، تلتقي تتشام كما تتشام الخيل، فما تعارف منها ائتلفَ، وما تناكر منها اختلفَ، ولو أَنَّ مؤمنًا دخل مسجدًا فيه مائة ليس فيهم إلَّا مؤمن واحد، لجاء حتى يجلس إليه، ولو أَنَّ منافقًا دخل مسجدًا فيه مائة ليس فيهم إلَّا منافقٌ واحد، لجاء حتى يجلسَ إليه.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٥٩

**فضيل بن عياض** دەڵێ: ڕۆحەکان کۆمەڵانێکی جیاوازن، هەرکامیان صیفاتەکانیان وەک یەک بێ و لە یەک بچن، ئەوە پێکەوە دەبن و لەگەڵ

یەک دەگونجێن، هەرکامیشیان هاوصیفات نەبن لەگەڵ یەک، ئەوە هەرچەندە لەم دونیاش لە یەک نزیک بن، بەڵام پێکەوە ناگونجێن، ناکرێ کەسێک ئەهلی سوننە بێ، بەڵام مەیلی هەبێ بۆ ئەهلی بیدعە، ئەمە تەنها لە موناڤق دەوەشێتەوە.

حدثنا أبو عمرو عثمان بن أحمد بن عبدالله الدَّقاق، قال: حدثنا جعفر بن محمد الخيَّاط، قال: حدثنا عبدالصمد بن يزيد الصائغ مردوية، قال: سمعت فضيل ابن عياض يقول: الأرواح جنود مجندة، فما تعارفَ منها ائتلفَ، وما تناكرَ اختلفَ، ولا يُمكنُ أن يكونَ صاحِبُ سُنَّةٍ يُمالئُ صاحِبَ بدعةٍ إلَّا مِنَّ النِّفاق.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٦١

**مبشر بن إسماعيل** دەڵێ: بە الأوزاعي وترا: پیاوێک هەیە دەڵێ: من لەگەڵ ئەهلی سوننە دادەنیشم، هەروەها لەگەڵ ئەهلی بیدەعیش دادەنیشم. الأوزاعي وتی: ئەمە پیاوێکە دەیەوێ یەکسانی بخاتە نێوان حەق و باتڵ و پێکەوە کۆیان بکاتەوە.

حدثنا أبو بكر المرُّوذي، قال: حدثنا زياد بن أيوب الطوسي، قال: حدثنا مُبَشرُ بن إسماعيل الحُبلي، قال: قيل للأوزاعي: إِنَّ رجلًا يقول: أنا أُجالسُ

أهلَ السُّنة، وأُجَالسُ أهل البدع. فقال الأوزاعي: هذا رجل يُريدُ أن يُساوي بين الحق والباطل.

كتاب السنة للخلال | ٢٣٨٧ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٦٢

**عبدالله بن عون** دەڵێ: پیاوێک چوویە ماڵی محمد بن سیرین، هەندێک قسەی کرد دەربارەی قەدەر، محمد ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِى الْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْىِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾. ئەنجا پەنجەی خستە ناو گوێیەکانی، بە پیاوەکەشی وت: هەستە جێم بهێڵە، یان من هەستم جێت بهێڵم. پیاوەکە هەستا چوویە دەرەوە، وتیان: ئەی باوکی بکر، با گوێت بگرتایە بۆ پیاوەکە. وتی: دڵم لە دەستی خۆمدا نییە، وە من ترسام شتێک بخاتە دڵمەوە دواتر نەتوانم دەریبکەم لە دڵم، بۆیە پێم خۆش بوو قسەکانی نەبیستم.

أخبرنا العباس بن محمد بن حاتم الدوري، قال: حدثنا بَكَّار بن محمد السدوسي، قال: حدثنا عبدالله بن عَونٍ، أَنَّ رجلًا دخل على محمد بن سيرين في بيته، فذكر له شيئًا من القدر، فقال محمد: ﴿ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ

بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِى الْقُرْبَىٰ وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾. قال: وأخذ بأصبعيه في أُذنيه، فقال: لتخرجنَّ من عندي، أو لأُخرُجنَّ عنك. قال: فخرج الرجل، فقالوا: يا أبا بكر، لو سمعت مِنَ الرجل. فقال محمد: إِنَّ قلبي ليس بيدي، وإني خفت أن ينفث في قلبي شيئًا لا أستطيع أن أُخرجَه مِن قلبي، فكان أَحَبُّ إليَّ أن لا أسمع كلامه.

كتاب السنة للخلال ا ١٩٢٦ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٦٤

**أحمد بن يوسف بن أسباط** دەڵێ: بیستم باوکم دەیوت: گوێی نادەمێ دەربارەی دینم پرسیار لە خاوەن بیدعەیەک بکەم یاخود زینا بکەم.

حدثنا ابن مُطرِّف، قال: حدثنا محمد المُسَيَّب، قال: حدثنا ابن خُبَيق، قال: حدثنا أَحمد بن يوسف بن أسباط، قال: سمعت أَبي يقول: ما أُبالي سألتُ صاحبَ بدعةٍ عن ديني أو زَنَيت.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٦٧

وتم: قەولی یوسف بن أسباط مەبەستی ئەوە نییە بەلایەوە ئاسایی بێ زینا بکات، لەکاتێکدا زینا تاوانی کەبیرەیە، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە زینا

چەندە تاوانە، دین وەرگرتن لە ئەهلی بیدەع و پرسیارکردن لێیان هێندەی زینا قورسە، ئەگەر بەلایەوە ئاسایی بوایە پرسیاری دینی لە بیدعەچی بکات، ئەوە بەلاشیەوە ئاسایی دەبوو زینا بکات، کەواتە هەردووکیان بەلایەوە جائز نەبووە و حەڕامە.

**مسلم بن يسار** دەڵێ: گوێیەکانت مەکەرەوە بۆ خاوەن بیدعە، چونکە عەقیدە و قەولی باتڵی وای تێدەکات دواتر نەتوانی لە دڵتی دەربهێنی.

حدثنا أبو بكر بن أبي دارم، قال: حدثنا أبو جعفر الحضرمي، قال: حدثنا مسروق بن المرزبان، قال: حدثنا أبو إسماعيل الفارسي، قال: سمعت محمد بن القاسم الأشعبي، قال: يسأل حماد بن زيد، فحدَّثه عن محمد بن واسع، قال: قال مسلم بن يسار: لا تُمَكِّن أُذُنيك مِن صاحب بدعةٍ، فيَصَّبُّ فيها ما لا تقدر أن تُخرجَه مِن قلبك.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٦٨

**يونس بن أبي إسحاق** دەڵێ: عامر الشعبي پێی وتم: هیچ مەجلسێک نییە هێندەی مانەوە و مەجلسی مزگەوت خۆشەویست بێ لام، تیایدا لای باوکت دادەنیشتین، پاشان هەڵدەستاینەوە دەچووین بۆ لای ربيع بن

ختيم قورئانی بۆ دەخوێندين، هەتا ئەم صەعافقانە پەيدابوون، والله لەسەر زبڵ و شوێنی فڕێدانی زبڵ دابنيشم پێم خۆشترە هەتا لە مزگەوت لەگەڵ ئەوانەدا دابنيشم.

حدثنا أبو بكر محمد التمار -بالبصرة- قال: حدثنا أبو داود، قال: حدثنا بن أبي صفوان، قال: حدثنا أبو قتيبة، قال: حدثنا يحيى بن أيوب البجلي، عن يونس، قال: قال لي الشَّعبي: ما مَجلسُ أَحَبَّ إليَّ مَنَ المسجد، إذ كُنا نجلسُ فيه إلى أبيك، ثم نَتَحَوَّل إلى الربيع بن خُثيم، فيُقرينا القرآن، حتى نشأ هؤلاء الصَّعافِقَة، والله لئن أجلس على كُناسةٍ أَحَبَّ إليَّ مِن أن أجلس معهم.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٢٦

الصعافقة بەو کەسانە دەوترێ کە بە پۆشاکی بازرگانانەوە دەچنە بازاڕ بۆ کڕين و فروشتن، بەڵام هيچ پارەيەکيان نييە، سەرمايە و ماڵی ئەوان تەنها پێکهاتووە لە قسە، عامەی خەڵکی بەم جۆرە کەسانە دەڵێن: مهلس واتە: تووشی خەياڵات و بێهۆشی عەقڵ بووە.

ئەمە پێناسەی الصعافقة بوو هەروەک چۆن إبن بطة لە دوای ڕيوايەت کردنی ئەثەری ژمارە «٦٢٩» هێناويەتی.

**یونس بن أبي إسحاق** دەڵێ: بیستم الشعبي سوێندی بە الله دەخوارد کە هیچ مەجلسێک نەبووە بەلایەوە هێندەی مزگەوت خۆشەویست بێ، پاشان وتی: والله ئەگەر لە شوێنی فڕێدانی زبڵ دابنیشم پێم خۆشترە هەتا لە مزگەوت دابنیشم.

حدثنا أبو بكر محمد بن بكر، قال: حدثنا أبو داود، قال: حدثنا عبدالله بن محمد الزهري، قال: حدثنا سفيان، عن يونس -يعني ابن أبي إسحاق- قال: سمعت الشَّعبي يحلفُ بالله ما كان مَجلسٌ أَحَبَّ إليَّ مَنَ المسجد، ثم قال: والله لئن أجلسَ في سُباطةٍ أحبُ إلىَّ مِن أن أجلس فيه.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٦٢٧

**صالح بن مسلم** دەڵێ: من لەگەڵ الشعبي بووم، کاتێک بە لای مزگەوتدا تێپەڕین، وتی: ئەم کەسانەی شوێن ڕەئی کەوتوون ئەم مزگەوتەیان لا ناشیرین کردووم و ڕقم لێیەتی، هەتا وای لێهاتووە لە زبڵی ماڵەوەم زیاتر ڕقم لێیەتی.

**محمد بن الصباح** لە ڕیوایەتەکەیدا دەڵێ: کێ لە مزگەوتەکە بوو؟ وتی: قەومێکی بەڕێز و گەورە، حکم بن عتیبة لەگەڵ هاوەڵەکانی.

حدثنا أبو بكر محمد بن بكر، قال: حدثنا أبو داود، قال: حدثنا محمد بن الصباح بن سفيان، قال: أخبرنا -قال: أبو داود: وحدثنا أبو تَوبة- وهذا حديثه، عن مبارك بن سعيد، عن صالح بن مسلم، قال: كنت مع الشَّعبي، فلما حاذينا المسجد، قال: لقد بَغَّضَ إليَّ هؤلاء الآرائيون هذا المسجد، حتى صارَ أبغض إليَّ مِن كُناسة داري .

زادَ ابن الصَّباح في حديثه: ومَن في المسجد يومئذٍ؟ قال: قوم نُبَلاء، الحَكَم بن عُتَيبة وأصحابه.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٢٨

حكم بن عتيبة الكندي أبو محمد الكوفي، ساڵی «١١٥» هیجری وەفاتی کردووە، ثقه و ئەهلی سوننە بووە، قوتابی و هاوەڵی إبراهيم النخعي بووە، بەڵام هەندێک کات بە ڕەئی فەتوای داوە، دەبینی عامر بن شراحیل الشعبي چۆن وەصفیان دەکات و دەڵێ بە هۆی ئەمانەوە مزگەوتم لەبەر چاو کەوتووە!

**صالح بن مسلم** دەڵێ: الشعبي وتی: ئێوە تیاچوون کاتێک وازتان لە ئاثار هێنا و دەستان گرت بە قیاسەوە، ئەم مزگەوتەم لەبەرچاو کەوتووە

و ڕقم لێیەتی، بەڵکو لە زبڵی ماڵەوەم زیاتر ڕقم لێیەتی، ئەی کۆمەڵی صەعافقە.

حدثنا أبو بكر محمد بن بكر، قال: حدثنا أبو داود، قال: حدثنا محمد بن مسعود، قال: حدثنا يحيى بن سعيد، عن صالح بن مسلم، قال: قال الشَّعبي: إنما هلكتم حين تركتم الآثار، وأخذتم بالقياس، لقد بَغَّضَ إليَّ هذا المسجد، بل هو أبغض مِن كُناسة داري، مَعشَرُ الصَّعافِقة

والصَّعافِقة: هم الذين يغدون إلى الأسواق في زيِّ التُّجَّار، ليس لهم رؤوس أموال، إنما رأس مالِ أحدهم الكلام، والعامَّةُ تُسمِّي مَن كانَ هذا: مُهلِّسُ.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٢٩

**عامر الشعبي** دەڵێ: هیچ کەلیمەیەک نییە هێندەی کەلیمەی: ڕات چییە، ڕات چییە، ڕقم لێی بێت و بێزراو بێ لام.

حدثنا أبو بكر محمد بن بكر، قال: حدثنا أبو داود، قال: حدثنا محمد بن العلاء، قال: حدثنا الأشجعي عبيدالله بن عبيدالرحمن، قال: حدثنا

إسماعيل بن أبي خالد، عن الشَّعبي، قال: ما مِن كلمةٍ أبغض إليَّ مِن: أرأيتَ، أرأيتَ.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٣١

**مالك بن أنس** دەڵێ: ئاگاداری خۆتان بن لە ئەهلی ڕەئی، چونکە ئەوانە دوژمنانی ئەهلی سوننەن.

حدثنا عبدالله بن محمد، حدثنا عبدالله بن محمد بن عبدالكريم، حدثنا الحسن بن عبدالله بن منصور، حدثنا الحُنَيني، قال: قال مالک بن أنس: إياكم وأصحاب الرأي فإنهم أعداء السُّنَّة.

حلية الأولياء لأبي نعيم | ٨٩٤٦

**فضيل بن عياض** دەڵێ: خاوەن بیدعە ئەمین مەبە لێی دەربارەی دینت بترسە لێی تووشی گومڕاییت بکات، وە لە کاروبارتدا ڕاوێژی پێمەکە، وە لەگەڵیشی دامەنیشە، هەرکەسێک لەگەڵ خاوەن بیدعە دابنیشێ، ئەوە الله ﷻ دڵی کوێر دەکات.

حدثنا أبو علي محمد بن أحمد بن إسحاق البزاز، قال: حدثنا أبو جعفر محمد بن نصر الصايغ، قال: حدثنا عبدالصمد بن يزيد الصايغ مردوية،

قال: قال الفُضيل: صاحبُ بدعة لا تأمنه على دينك، ولا تُشاوره في أمرك، ولا تجلس إليه، ومَن جلسَ إلى صاحبِ بدعة أورثه الله العمى. - يعني: في قلبه.-

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٦٩

**فضيل بن عياض** دەڵێ: الله ﷻ هەندێک مەلائیکەی هەن دەگەڕێن بەسەر مەجالسی زیکردا، کەواتە بزانە مەجلس و دانیشتنت لەگەڵ کێیە، با دانیشتنت لەگەڵ خاوەن بیدعە نەبێ، چونکە الله ﷻ تەماشایان ناکات، وە نیشانەی موناڧقی ئینسان ئەوەیە هەستان و دانیشتنی لەگەڵ خاوەن بیدعە بێ.

قال: وقال الفُضيلُ: إِنَّ لله ملائكةً يطلبون حِلَقِ الذِّكر، فانظر مع مَن يكُن مجلسك، لا يكُن مع صاحب بدعة، فإنَّ الله لا ينظر إليهم، وعلامة النِّفاق أن يقوم الرجلُ ويقعد مع صاحب بدعة.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٦٩/ب

**محمد بن النضر الحارثي** دەڵێ: هەرکەسێک گوێی شل بکات بۆ خاوەن بیدعەیەک، ئەوە پارێزراوی و خۆپاراستنی لە تاوان لێدەسەندرێتەوە، وە دەدرێتە دەست نەفسی خۆی.

حدثنا أبو حفص عمر بن محمد رجاء، وأبو صالح محمد بن أحمد بن ثابت، قالا: حدثنا أبو جعفر محمد بن داود البصروي، قال: حدثنا إسحاق بن داود، قال: حدثنا أبو محمد الأنطاكي، قال: سمعت يوسف بن أسباط، يقول: سمعت محمد ابن النضر الحارثي، يقول: مَن أصغى بسمعه إلى صاحب بدعة، نُزعت مِنه العِصمة، وَوُكِل إلى نفسه.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٧٠ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٥٢ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٩٤٨

**سفيان الثوري** دەڵێ: هەرکەسێک گوێی شل بکات بۆ خاوەن بیدعەیەک، ئەوە لە پارێزراوی الله ﷻ دەردەچێ، وە دەدرێتە دەست نەفسی خۆی.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا قطنُ بن إبراهيم النيسابوري، قال: حدثنا الحسن بن الربيع، قال: حدثنا يحيى

بن عمر الثقفي، أنه سمع سفيان الثوري يقول: من أصغى بسمعه إلى صاحب بدعة، خرج مِن عِصمة الله، وَوُكِل إلى نفسه.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٧٢

**يونس بن عبيد** دەڵێ: هیچ کەسێک لە ئێوە گوێی شل نەکات بۆ خاوەن هەوا و ئارەزوو.

وە **محمد بن سيرين** دەڵێ: من ئەگەر بزانم یەکێک لە ئێوە کاتێک لای ئەهلی بیدەع هەڵدەستێتەوە پێشتر چۆن بووە کاتێکیش ئەوان جێدەهێڵێ هەروەک خۆی بمێنێتەوە و کاریگەریان نەبێ لەسەری ئەوە گوێم نەدەدایێ.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا أبو الربيع الزهراني، قال: حدثنا حماد بن زيد، قال: قال لنا يونس بن عُبيد: لا يُمكِّن أحدكم سمعه مِن ذي هوى.

وقال محمد: لو أني أعلم أنَّ أحدكم يقوم مِن عندهم كما جلس لَم أُبالِ.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٧٣

وتم: مەبەستی ئەوەیە ئینسان ئەگەر عەقیدەشی صحیح بێ، بەڵام کاتێک دەچێتە مەجلسی ئەهلی بیدەع گۆڕانکاری بەسەردا دێ، هەربۆیە دەبینی إبن سیرین دەڵێ گەر بزانم دانیشتنتان لەگەڵیان هیچ تەئسیرێکی نابێ لەسەرتان ئەوە ئاسایی دەبوو لە لام.

**إبن عون** دەڵێ: هیچ کات هیچ یەکێک لە ئێوە گوێی شل نەکات بۆ هەوا و ئارەزوو.

حدثنا أبو القاسم، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا أحمد بن إبراهيم بن كثير الدورقي، قال: حدثني أبو عبيدة، قال: حدثني عبدالرحمن بن مهدي، عن حماد بن زيد، قال: سمعت ابن عَون، يقول: لا يُمكِّن أحد منكم أُذنيه مِن هوًى أبدًا.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٧٤

**محمد بن النضر الحارثي** دەڵێ: ئەصحابی هەوا و ئارەزوو دەسیان دایە بنیادنانی گومڕایی و کوژاندنەوە و لەناوبردنی ڕێنمونی و ڕێگای ڕاست، ئاگادار بن خۆتان بپارێزن لێیان.

حدثنا المتّوثي، قال: حدثنا أبو داود، قال: حدثنا محمد بن سليمان الأنباري، قال: حدثنا عبادة بن كليب، قال: قال محمد بن النضر الحارثي: إنَّ أَصحاب الأهواء قد أَخذوا في تأسيس الضلالة، وطمس الهُدى، فاحذروهم.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٧٥

**مغيرة** دەڵێ: محمد بن سائب لە عەقيدەيدا هيچ گومڕاييەک نەبوو، وتی: هەستن بمانبەن بۆ لای مورجيئە هەتا قسەکانيان ببيستين بزانين چی دەڵێن! کاتێک ڕۆيشت بۆ لايان عەقيدەی تێک چوو وتەکانی ئەوان چووە دڵيەوە.

حدثنا أبو القاسم، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: وحُدِّثتُ عن أبي بكر بن عياش، قال: قال مغيرة: خرج محمد بن السائب الكلبي وما كان له هوى. فقال: قوموا بنا إلى المرجئة حتى نسمع كلامهم! فما رجع حتى عَلِقَه.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٧٧

وە لە ڕیوایەتی ژمارە «٥٠٢» هێناویەتی دەڵێ: خرج محمد بن السائب وما كان له هوًى، فقال: اذهبوا بنا حتى نسمع قولهم، فما رَجع حتى أُخذَ بها، وعَلَقت قلبَه.

**فضيل بن عياض** دەڵێ: هەرکەسێک تەوازوعی هەبێ ئەوە الله ﷻ بەرزی دەکاتەوە، وە هەرکەسێک مەجلس و دانیشتنی لەگەڵ هەژاران بێ ئەوە سوودی پێ دەگەیێنێ، وریابە و خۆت بپارێزە لەوەی دانیشتن و مەجلست لەگەڵ ئەوانە بێ دڵت خراپ دەکەن، وە لەگەڵ خاوەن هەوا و ئارەزوو دامەنیشە، چونکە من لە تووڕەیی ﷻ دەترسم بەسەرتەوە.

حدثنا أبو القاسم، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا عمران بن موسى الطرسوسي، قال: حدثنا عبدالصمد -خادم الفُضيل- قال: سمعت الفُضيل بن عياض، يقول: مَن تواضع لله رفعه، ومَن كان مجلسه مع مساكين نفعه، وإياك أن تجلسَ مع من يُفسد عليك قلبك، ولا تجلس مع صاحب هوًى، فإني أخاف عليك مَقتَ الله.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٧٨ ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٠٥٠

**إسماعيل الطوسي** دەڵێ: عبدالله بن مبارک پێی وتم: مەجلس و دانیشتنت لەگەڵ هەژاران بێ، وریابە نەکەی مەجلس و دانیشتنت لەگەڵ خاوەن بیدعە بێ.

حدثنا أَبو علي محمد بن إسحاق الصَوَّاف، قال: حدثنا أَبو جعفر محمد بن نصر، قال: حدثنا عبدالصمد بن يزيد الصائغ، قال: سمعت إسماعيل الطوسي، قال: قال لي ابن المبارک: يكون مجلسک مع المساكين، وإياک أن تجالس مع صاحب بدعة.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٧٩ شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة للالكائي | ٢٦٠

**محمد بن يوسف الفريابي** دەڵێ: سفيان الثوري ڕێگری لێدەکردم لەگەڵ فڵان دابنیشم. -واتە کەسێک لە ئەهلی بیدەع.-

حدثنا أَبو القاسم، قال: حدثنا أَبو حاتم، قال: حدثنا يحيى بن عثمان الحمصي، قال: حدثنا الفريابي، قال: كان سفيان الثوري ينهاني عن مُجالسَةِ فلان. -يعني: رجلًا مِن أَهل البدع- .

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٨١

**الحكم بن سليمان** دەڵێ: بیستم پرسیار کرا لە الأوزاعي دەربارەی قەدەریە؟ وتی: لەگەڵیان دامەنیشن.

حدثنا أبو القاسم، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا أبو سعيد الأشج، قال: حدثنا الحكم بن سليمان أبو الهذيل الكِندي، قال: سمعت الأوزاعي سُئل عن القدرية؟ فقال: لا تُجالسوهم.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٨٢

**مقاتل بن محمد** دەڵێ: عبدالرحمن بن مهدي پێی وتم: ئەی باوکی حسن، لەگەڵ ئەوانە ئەصحابی بیدەع دامەنیشە، ئەمانە فەتوا لە شتانێک دەدەن کە مەلائیکە دەسەڵاتیان نییە لێی و ناتوانن قسەی تێدا بکەن.

حدثنا أبو القاسم، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا مقاتل بن محمد، قال: قال لي عبدالرحمن بن مهدي: يا أبا الحسن، لا تُجالس هؤلاء أصحاب البدع، إنَّ هؤلاء يُفتون فيما تعجَزُ عنه الملائكة.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٨٣

**عون بن عبدالله** دەڵێ: لەگەڵ ئەهلی قەدەر دامەنیشن، وە مشتومڕ و موناقەشەیان لەگەڵ مەکەن، چونکە ئەوانە بەشێکی قورئان دەدەن بە گژی بەشێکی تریدا.

حدثنا أبو عمر حمزة بن القاسم الهاشمي خطيب جامع المنصور، قال: حدثنا حنبل بن إسحاق، قال: حدثنا سعيد بن منصور، قال: حدثنا يعقوب، عن أبيه، قال: قال عَون بن عبدالله: لا تُجالسوا أهل القَدَر، ولا تُخاصموهم، فإنهم يضربون القرآن بعضه ببعض.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٩١

**خويل زاواى شعبة بن حجاج** دەڵێ: من لای یونس بن عبید بووم، پیاوێک هات وتی: ئەی باوکی عبدالله، تۆ ڕێگریمان لێدەکەی لەگەڵ عمرو بن عبید دابنیشین، کەچی کوڕەکەت چووە ژوورەوە بۆ لای؟! وتی: کوڕی من؟ وتی: بەڵێ. یونس تووڕە بوو، لە جێی خۆی نەجوڵا هەتا کوڕەکەی هات، وتی: ئەی کوڕم، تۆ دەزانی عەقیدە و ڕەئی عمرو بن عبید، لەگەڵ ئەوەشدا دەچیت بۆ لای؟! دەستی کردە عوزر هێنانەوە، وتی: فڵانە کەسم لەگەڵ بوو بۆیە چوومە لای، یونس وتی: نەهی دەکەم لە زینا و دزی و خواردنەوەی مەشروب ، ئەگەر عەبدێک بەو تاوانانەوە

بگاتەوە خزمەتی الله ﷻ بەلامەوە باشترە هەتا بە عەقیدە و ڕەئی عمرو بن عبید و ئەصحابی عمرو بن عبید واتە قەدەرییەکان بگاتەوە خزمەتی الله ﷻ. سعید بن عامر دەڵێ: هیچ پیاوێکمان نەدیوە هێندەی یونس باش بێ.

حدثنا أبو بكر أحمد بن سليمان العبَّاداني، قال: حدثنا محمد بن عبدالملك الدَّقِيقي، قال: حدثنا سعيد بن عامر، قال: حدثنا حرب بن ميمون، عن خُوَيْل -خَتَنُ شُعبة ابن الحجاج- قال: كنت عند يونس بن عُبيد فجاء رجل فقال: يا أبا عبدالله، تنهانا عن مُجالسة عمرو بن عُبيد، وقد دخل عليه إبنک؟! قال: إبني؟ قال: نعم. فَتَغَيَّظَ يونس، فلم أبرح حتى جاء إبنه، فقال: يا بُني، قد عرفتَ رأي عمرو بن عبيد، ثم تدخل إليه؟! فجعل يعتذر، فقال: كان معي فلان، فقال يونس: أنهى عن الزنا، والسَّرقة، وشرب الخمر، ولئن تلقى الله ﷻ بهذا أحب من أن تلقاه برأي عمرو بن عبيد، وأصحاب عمرو. -يعني: القدرية- قال سعيد بن عامر: ما رأينا رجلًا قط كان أفضل منه. يعني: يونس.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٩٢

**عمرو بن مالک** دەڵێ: لای أبو الجوزاء باسی ئەهلی هەوا و ئارەزوو کرا، وتی: سوێند بەو زاتەی گیانمی بە دەستە ماڵەکەم پڕ بێ لە مەیمون و بەراز پێم خۆشترە لەوەی کەسێک لەوان دراوسێم بێت و لەگەڵم بژی.

حدثنا أبو علي الحسن بن عمر بن شقيق، قال: حدثنا حماد بن زيد، قال: عن عمرو بن مالک، عن أبي الجوزاء قال: ذكر عنده أصحاب الأهواء، فقال: والذي نفسي بيده لأن تمتلئ داري قردة وخنازير معي أَحَبُّ إليَّ من أن يجاورني رجلُ منهم.

كتاب القدر للفريابي ا ٣٧١ كتاب الشريعة للآجري ا ٢٠٥٦ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٤٩٦ كتاب أصول السنة لابن أبي زمنين ا ٢٤٥ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٣١ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٧٩٠

وتم: ماڵت بەراز و مەیمونی تێدا بێ زەرەری نییە بۆ دینەکەت، بەڵام ئەگەر هاتوو بیدعەچی تێدا بێ ئەوە زەرەر دەدات لە دینەکەت، بچوکترین زەرەری ئەوەیە ئولفەتت بۆی دروست دەبێ، ئەوکات دەبیتە نمونەیەکی خراپ خەڵکی ئیمان لاواز چاوت لێدەکەن، وردە وردە بابەتی الولاء والبراء بەلاتەوە کاڵ دەبێتەوە.

**عبدالعزيز بن خطاب** دەڵێ: سەگێکی ڕەشی گەورەی نەخۆش لای مالک بن دینار بوو، پێیان وت: ئەی باوکی یحیی ئەو سەگە نابینی لە تەنیشتدا؟ وتی: دەیبینم، ئەوە خێردارترە هەتا کەسێکی خراپ لە مەجلس و تەنیشتم بێ.

حدثنا محمد بن احمد بن الفرج البغدادي بالابلة، حدثنا ابراهيم بن حماد ابن زياد، حدثنا عبدالعزيز بن خطاب، قال: رُئِيَ إلى جنب مالک بن دينار كلبٌ عظيم ضَخم أسود رابض، فقيل له: يا أبا يحيى ألا ترى هذا الكلب إلى جنبک؟ قال: هذا خير من جليس السوء.

روضة العقلاء لابن حبان ا ٢٤٠ الإعتصام بالعزلة للخطابي ا صـ : ٧٥

وتم: تەماشای ئەم جۆرە ئاثارانە دەکەی ئەوکات بە جوانی بۆت دەردەکەوێ سەلەف چەندە ڕقیان لە ئەهلی بیدەع بووە، بەڵام کاتێک ئێستا خەڵکی لەسەر ڕێڕەوی سەلەف ناچن، لەگەڵ هەموو موبتەدعێک دەست کراوەن و هەڵسوکەوت دەکەن، کاتێکیش بە پێی مەنهەجی سەلەف ڕەدیان دەدەیتەوە، قبوڵی ناکەن، بەڕاستی حاڵی کردنی ئەو جۆرە کەسانە زۆر قورسە ئەستەمە بتوانی ئەهلی جەهل تێبگەیێنی کە مەنهەجی ئەهلی سوننە هەجر و بوغزاندنی ئەهلی بیدەع و ڕیجالی سوء

بووە و شوبهاندوونیان بە سەگ و لە سەنگیش خراپتر، چونکە سەگ ئەمینی لێی لەوەی تووشی شوبهە و هەڵدێرت بکات لە دینەکەتدا، بەڵام ئەهلی بیدەع ئەمین نی لێیان.

**بقية بن الوليد** دەڵێ: أرطأة بن منذر پێی وتم: ئەی باوکی یحمد، ئەگەر کوڕەکەم یەکێک بێ لە فاسقەکان پێم خۆشترە و بەلامەوە باشترە هەتا ئەوەی کەسێکی خاوەن هەوا و ئارەزوو بێت.

أخبرنا محمد بن موسى، حدثنا الأَصَم، حدثنا الصاغاني، حدثنا أبو همام، حدثنا بَقيَة، قال: قال لي أَرطأة بن المنذر السَّكوني: يا أبا يُحمَد، لأن يكون ابني فاسقًا مِنَ الفُسَّاق أحب إليه مِن أن يكون صاحِبَ هوى.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ٩٢٩ الشرح والإبانة لابن بطة ا ٩١ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٣٠٤

**إبن قاسم** دەڵێ: مالک بن أنس دەڵێ: هیچ ئایەتێک نییە لە کتابی اللە ـدا هێندەی ئەم ئایەتە قورس بێ لەسەر ئەهلی هەوا و ئارەزوو: ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ۚ فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ

إِيمَانِكُمْ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾. چ کەلامێک هەیە هێندە ڕوون؟

**إبن قاسم** دەڵێ: مالک پێی وتم: ئەم ئایەتە بۆ ئەهلی قیبلەیە.

**سحنون** دەڵێ: إبن غانم دەربارەی کەراهەتی دانیشتن لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوو دەیوت: تەماشاکەن ئەگەر یەکێک لە ئێوە لای دزێک دابنیشێ، وە پێداویستییەک لە دەستیدا بێ، ئایا نابینی چۆن دەیپارێزێ نەوەک دزەکە دەستی پێی بگات؟ دەی دینەکەتان لەپێشترە بە حەزەر کردن و پاراستنی، وترا: ئەگەر لە سەنگەر بین ئەهلی بیدەع دەربکەین؟ وتی: بەڵێ.

وحدثني إسحاق، عن محمد بن عمرو بن لُبابة، عن العُتبي، عن سَحنون، عن ابن القاسم، قال: قال مالک: ما آية في كتاب الله أَشَدُّ على أهل الأهواء مِن هذه الآية: ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ۚ فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾. قال مالک: فأيُ كلامٍ أبيَنُ مِن هذا؟

قال ابن القاسم: قال لي مالک: إنَّ هذه الآية لأهل القِبلة.

قال سَحنون: وكان ابن غانم، يقول في كراهية مُجالسة أهل الأهواء: أرأَيت إن أحدَكم قَعَدَ إلى سارقٍ، وفي كُمِّه بضاعة، أما كانَ يَحترَزُ بها مِنه، خوفًا أن ينالَه فيها؟ فَدِينكم أولى بأَن تُحرِزوه، وتُحفظوا به، قيل: وإن جامعناهم في ثَغرٍ، أُخرجناهم مِنه؟ قال: نعم.

كتاب أصول السنة لابن أبي زمنين | ٢٤٨

**فضيل بن عياض** دەڵێ: پێم خۆشە نێوانی من لەگەڵ موبتەدعێک قەڵایەک بێ لە ئاسن.

حدثنا أبو علي محمد بن أحمد بن إسحاق، قال: حدثنا أبو جعفر محمد بن نصر بن منصور الصائغ، قال: حدثنا عبدالصمد بن يزيد الصائغ، قال: سمعت فضيل بن عياض يقول: أُحِبُّ أن يكونَ بيني وبين المُبتدع حِصن مِن حديد.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٤٩٨

**فضيل بن عياض** دەڵێ: هەرکەسێک لەگەڵ خاوەن بیدعەیەک دابنیشێ ئەوە ئاگاداری خۆتبە لێی، وە هەرکەسێک لەگەڵ خاوەن بیدعەیەک دابنیشێ حیکمەت و دانایی پێنادرێ، وە پێم خۆشە نێوانی

من لەگەڵ خاوەن بیدعە قەڵایەک بێ لە ئاسن، لای جوولەکە و نەصرانییەک نان بخۆم پێم خۆشترە هەتا لای خاوەن بیدعەیەک نان بخۆم.

أخبرنا الحسن بن عثمان، قال: أخبرنا أحمد بن حمدان، قال: حدثنا أحمد بن الحسن، قال: حدثنا عبدالصمد -مَردوية- قال: سمعت فضيل -يعني ابن عياض- يقول: مَن جلس مع صاحب بدعة فاحذره، ومَن جلس مع صاحب البدعة لم يُعطَ الحكمة، وأُحِبُّ أن يكونَ بيني وبين صاحب بدعة حِصن مِن حديد، آكل عند اليهودي والنصراني أَحَبُ إلي مِن أن آكل عند صاحب بدعة.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ١١٤٩ ذم الكلام وأهله للهروي ا ١٠٤٨

ئەم ئەثەرە لای **الهروي** بەس ئەم بەشەی هاتووە: آكل عند اليهودي والنصراني، أَحَبُ إلي مِن أن آكل عند صاحب بدعة.

**قاضي شريک** دەڵێ: ئەگەر هەموو هۆزێک مەشرووب فرۆشێکی تێدابێ، پێم باشترە هەتا ئەوەی کەسێکی شوێنکەوتەی باوکی فڵانی تێدابێ. پیاوێکی موبتەدع بوو.

حدثنا أبو القاسم جعفر بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا عبدالله بن سعيد الأشج، قال: حدثنا يحيى بن يسار، قال: سمعت شريكًا يقول: لأن يكون في كُل قبيلةٍ خَمَّارُ، أُحَبُّ إليَّ مِن أن يكون فيها رجلُ من أصحاب أبي فلان. رجُلُ كان مُبتدعًا.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٠٠

**أحمد بن سنان** دەڵێ: ئەگەر ساز لێدەر دراوسێم بێ، پێم خۆشترە هەتا ئەوەی خاوەن بیدعە دراوسێم بێ، هەرچی خاوەن سازە ڕێگری لێدەکەم و سازەکەشی دەشکێنم، ئەمما موبتەدعەکە ئەوە خەڵکی و دراوسێ و گەنجەکان گومڕا دەکات و دڵیان پیس دەکات.

وقال أبو حاتم: وسمعت أحمد بن سنان يقول: لأن يُجاورني صاحب طنبورٍ، أَحَبُّ إليَّ مِن أن يُجاورني صاحبُ بدعةٍ، لأن صاحب الطنبور أنهاه، وأكسِرُ الطنبور، والمُبتدعُ يُفسدُ الناس، والجيرانَ، والأحداث.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٥٠٠/أ

**أبو حاتم** دەڵێ: أحمد بن سنان دەیوت: ئەگەر پیاوێک بوویە دراوسێی خاوەن بیدعەیەک، وای دەبینم ئەگەر توانی ئەوە با خانووەکەی بفرۆشێ بیگوێزێتەوە بۆ شوێنێکی تر، ئەگەرنا ئەوە کوڕ و دراوسێکانی بە هیلاک دەبات.

أبو سنان حوکمی ئەو وتەیەی لەم حدیثەی ڕەسول الله ﷺ وەرگرت: « هەرکەسێک لە ئێوە بیستی دەجال دەرچووە ئەوە با خۆی دوور بگرێ - سێ جار ئەمەی وت- پیاوی وا هەیە دێت بۆ لای، وە بە درۆزن دەیبینێ، کەچی شوێنی دەکەوێ بەهۆی ئەو هەموو شوبهاتەی پێیەتی ».

قال أبو حاتم: وسمعت أحمد بن سنان يقول: إذا جاور الرجلُ صاحب بدعة أرى له أن يَبيعَ دارَه إن أمكنه، وليَتَحَوَّل وإلا أهلكَ ولده، وجيرانه.

فنزع إبن سنان بحديث رسول الله ﷺ قال: « **مَن سَمِعَ مِنْكُم بِالدَّجَّالِ فَلْيَنْأَ عَنْهُ -قَالهَا ثَلاثًا- فَإِنَّ الرَّجُلَ يَأتِيه، وَهُوَ يَرَى أَنَّهُ كَاذِبٌ، فَيَتَبِعُهُ لِمَا يَرَى مِنَ الشُّبُهَاتِ** ».

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٥٠٠/ب

**أحمد بن أبي الحواري** دەڵێ: عبدالله بن السري -یەکێک بوو لە خاشعین لە ژیانمدا کەسم نەدیوە هێندەی ئەو بە خشوع بێ- پێی وتم: لای ئێمە لە سوننە نییە ڕەدی ئەهلی هەوا و ئارەزوو بدرێتەوە، بەڵکو سوننە لای ئێمە ئەوەیە قسە لەگەڵ هیچ یەکێکیان نەکرێ.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا أحمد بن أبي الحواري، قال: قال لي عبدالله بن السِّري -وكان من الخاشعين، ما رأيت قَطُّ أخشع منه-: ليس السُّنة عندنا أن تُردَّ على أهل الأهواء، ولكن السُّنة عندنا أن لا تُكَلِّم أحدًا منهم.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٠٥

**سلام بن أبي مطيع** دەڵێ: پیاوێکی ئەهلی هەوا و ئارەزوو بە أیوب السختیانی وت: ئەی باوکی بکر، پرسیارێکم هەیە لێت دەربارەی کەلیمەیەک، أیوب پشتی هەڵکرد، بە پەنجەی ئیشارەتی کرد نەخێر پرسیاری نیو کەلیمەشم لێمەکە، نەخێر پرسیاری نیو کەلیمەش لێمەکە. سەعید ئیشارەتی بۆ کردین بە پەنجە بچووکەی دەستی ڕاستی.

أخبرنا سَعيد، عن سلام بن أبي مطيع: أن رجلاً من أصحاب الأهواء قال لأيوبٍ: يا أبا بكر، أسألك عن كلمةٍ؟ قال: فولى وهو يشير بإصبعه ولا نصف كلمةٍ، ولا نصف كلمةٍ. وأشَارَ لنا سعيد بِخِنْصِرِه اليُمنى.

سنن الدارمي | ٤١٠ كتاب القدر للفريابي | ٣٧٤ كتاب السنة لعبدالله | ١١٠ كتاب الشريعة للآجري | ١٢٠ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٠٩

سويد دەڵێ: عبدالرحمن بن مهدي باسی صۆفیەکانی کرد وتی: لەگەڵیان دامەنیشن، هەروەها لەگەڵ ئەهلی کەلام دامەنیشن، بەڵکو لەگەڵ ئەصحابی قماطر دابنیشن، چونکە ئەوانە وەک ئەصحابی مەعدەن وان، نمونەی غەواصن ئەمیان دوڕە دەردێنێ، وە ئەویتریشیان پارچەیەک لە ئاڵتون.

حدثنا سويد، قال: سمعت عبدالرحمن بن مهدي، وذكر الصُّوفية فقال: لا تُجالسوهم، ولا أصحاب الكلام، عليكم بأصحاب القَماطر، فإنما هم بمنزلة أصحاب المعادن، مثل الغَوَّاص هذا يُخرج دُرَّةً، وهذا يُخرج قطعة ذهب.

كتاب السنة للخلال | ٢٣٨٨ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥١٠

قماطر بەو کەسانە دەوترێ کتێبی حدیث کۆدەکەنەوە، پاشان ئەوەی پێویستیانە لێی دەردەهێنن وەک بەڵگە لە ژیانیاندا بەکاریدەهێنن.

**حبيب بن الزبرقان** دەڵێ: محمد بن سيرين هەرکات کەلیمەیەکی لە خاوەن بیدعەیەک ببیستایە، هەردوو پەنجەی دەخستە گوێیەکانی، پاشان دەیوت: حەڵاڵ نییە بۆم قسەی لەگەڵ بکەم هەتا هەستێتەوە لە مەجلسەکەی.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم الرازي، قال: حدثنا الوليد بن الزبير الحضرمي، قال: حدثنا بقية بن الوليد، قال: حدثنا أبو سلمة سليمان بن سليم، قال: حدثنا حبيب بن أبي الزبرقان، عن محمد بن سيرين، أنه كان إذا سَمِعَ كلمةً مِن صاحب بدعةٍ، وضع أُصبعيه في أُذُنَيهِ، ثم قال: لا يَحِلُّ لي أن أُكَلِّمَه حتى يقوم مِن مجلسِه.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥١١

**صالح المري** دەڵێ: فڵانە کەسی ئەهلی بیدەع چوویە لای محمد بن سيرين، من لەوێ بووم و سەیرم دەکرد، بابێک لە بابەکانی قەدەری

کردەوە و قسەی تێدا دەکرد، إبن سیرین پێی وت: پێم خۆشە هەستی جێیان بهێڵی، ئەگەرنا ئەوە ئێمە هەڵدەستینەوە.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا سعيد بن سليمان، قال: حدثنا صالح المُرِّي، قال: دخل على ابن سيرين فلان - يعني: رجلًا مبتدعًا- وأنا شاهد، ففتح بابًا من أبواب القدر، فتكلَّمَ فيه، فقال له ابن سيرين: أُحِبُّ لک أن تقوم، وإما أن نقوم.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥١٢

**إبن عون** دەڵێ: ئەوانەی لەگەڵ ئەهلی بیدەع دادەنیشن مەترسیان زیاترە لەسەرمان هەتا ئەهلی بیدەع .

حدثنا أبو عبدالله محمد بن مخلد العطَّار، قال: حدثنا محمد بن الحسين المُرِّي، قال: حدثني أحمد بن منصور الكِندي، عن شعيب بن حرب، قال: قال ابن عَون: مَن يُجالسُ أهل البدع أَشَدُّ علينا مِن أهل البدع.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥١٣

**جعفر بن سليمان** دەڵێ: بيستم عتبة الغلام دەيوت: هەركەسێک لەگەڵ ئێمە ئەهلی سوننە نەبێ ئەوە دژمانە.

حدثني أبو علي إسحاق بن إبراهيم الحُلواني، قال: حدثنا يعقوب بن يوسف بن دينار، قال: حدثنا أحمد بن داود الحداد، قال: حدثني جعفر بن سليمان الضُبَعي، قال: سمعت عُتبة الغلام، يقول: مَن لم يكن معنا فهو علينا.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥١٤

**أبو عبدالرحمن السلمي** دەڵێ: هەر پیاوێک لەوانەی لای شقيق الضبي دانیشتووە نەیێتە مەجلسم و لەگەڵم دانەنیشێ.

**أبو عبدالله أحمد بن حنبل** دەڵێ: شقيق كەسێک بوو مشتومڕ و موناقەشەی دەکرد.

حدثنا أبو حفص عمر بن محمد بن رجاء، قال: حدثنا أبو نصر عصمة بن أبي عصمة، قال: حدثنا الفضل بن زياد، قال: حدثنا أحمد بن حنبل، قال: حدثنا أسود بن عامر، قال: حدثنا أبو بكر، عن عاصم، قال: كان أبو

عبدالرحمن، يقول: لا يُجالسني رَجُلُ جالسَ شقيقًا الضَّبِّيَّ. قال أبو عبدالله: كان يُخاصم.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٥١٦

**يحيى بن أبي كثير** دەڵێ: ئەگەر لە ڕێگادا گەیشتی بە خاوەن بیدعەیەک، ئەو ڕێگەیەی ئەوی لێیە بیگۆڕە بچۆرە سەر ڕێگایەکی تر.

حدثنا أبو الأصبغ عبدالعزيز بن يحيى، قال: حدثنا أبو إسحاق الفزاري، عن الأوزاعي، عن يحيى بن أبي كثير، قال: إذا لقيتَ صاحبَ بدعةٍ في طريقٍ، فخذ في طريقٍ غيره.

كتاب القدر للفريابي ا ٣٧٢ كتاب الشريعة للآجري ا ١٣٥ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٥١٧ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٥٩ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٨٤٧

**فضيل بن عياض** دەڵێ: ئەگەر لە ڕێگادا موبتەدعێکت بینی، ئەو ڕێگەیەی ئەوی لێیە بیگۆڕە بچۆرە سەر ڕێگایەکی تر.

وحدثنا أبو علي محمد بن أحمد بن إسحاق، قال: حدثنا أبو بكر محمد بن أحمد بن النضر، قال: حدثنا عبدالصمد بن يزيد الصائغ مردوية، قال:

سمعت الفضيل ابن عياض، يقول: إذا رأيت مبتدعًا في طريق، فخذ في طريقٍ آخر.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٢٠

**إبن هانئ** دەڵێ: پرسیارم کرد لە أبا عبدالله أحمد بن حنبل دەربارەی پیاوێکی موبتەدیع داعییە بۆ بیدعەکەی؟ وتی: لەگەڵی دانانیشرێ، وە قسەشی لەگەڵ ناکرێ بەشکو تەوبە بکات.

حدثنا أبو الفضل جعفر بن محمد القافُلائي، قال: حدثنا إسحاق بن إبراهيم بن هانئ، قال: سألت أبا عبدالله عن رجلٍ مبتدعٍ داعيةٍ يدعو إلى بدعته؟ قال أبو عبدالله: لا يُجالس، ولا يُكلَّم لعلَّه يتوب.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٢١

**حنبل بن إسحاق** دەڵێ: بیستم أبا عبدالله أحمد بن حنبل دەیوت: ئەهلی بیدەع بۆ هیچ کەسێک نییە لەگەڵیان دابنیشێ و قسەیان لەگەڵ بکات و نەرمی و ئولفەت بنوێنێ بەرامبەریان.

حدثنا أبو حفص عمر بن أحمد، قال: حدثنا أبو نصر عِصمة، قال: حدثنا حنبل بن إسحاق، قال: سمعت أبا عبدالله يقول: أَهل البدع ما ينبغي لأَحدٍ أن يُجالسهم، ولا يُخاطبهم، ولا يأنس بهم.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٢٢

**أبا عبدالله أحمد بن حنبل** دەڵێ: ثور بن يزيد الكلاعي چوويە مەدینە، بە مالک بن أنس وترا: ئایا ناچی بۆ لای؟ وتی: لە مزگەوتی ڕەسول الله ﷺ لەگەڵ پیاوێکی موبتەدع کۆنابینەوە.

حدثنا منصور بن الوليد النيسابوري، قال: حدثنا علي بن سعد، قال: سمعت أبا عبدالله يقول: قِدِمَ ثورُ المدينة، فقيل لمالک: ألا تأتيه؟ فقال: لا نجتمعُ عند رجلٍ مبتدعٍ في مسجدِ رسول الله ﷺ.

كتاب السنة للخلال | ٢٣٨٩ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٢٣

**محمد بن موسى** دەڵێ: أبو عبدالله أحمد با حنبل -باسی قصەی ثور ی کرد- وتی: پێم گەیشتووە چووەتە مەدینە، بە مالک بن أنس وتراوە: ئەوە ثور بن يزيد الكلاعي هاتووەتە مەدینە. ئەویش وتوویەتی: مەچن بۆ لای.

حدثنا أبو إسحاق إبراهيم بن علي القطيعي، قال: حدثنا أبو علي ابن الخلال، قال: حدثنا محمد بن موسى بن مُشيش، قال: قال أبو عبدالله - وقد ذكر قِصَّة ثور- : بلغني أنه قَدِمَ المدينة، فقيل لمالک: قد قَدِمَ ثورُ. فقال: لا تأتوه.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٢٤

**أحمد بن حنبل** دەڵێ: ثور بن يزيد الكلاعي ئەهلی قەدەر بوو خەڵكی حمص بوو، لەوێ دەرکرا و دوورخرايەوە لەبەر قەولی قەدەر.

وە پێم گەیشتووە چووە بۆ مەدینە بە مالک بن أنس وتراوە: ثور هاتووەتە مەدینە، ئەویش وتی: مەچن بۆ لای، نابێ لە مزگەوتی ڕەسول الله ﷺ لەگەڵ پیاوێکی موبتەدع کۆببیتەوە.

قال عبدالله بن أحمد، عن أبيه أحمد بن حنبل، أنه قال: كان ثور بن يزيد الكلاعي كان يرى القدر وكان مِن أهل حمص. أخرجوه ونفوه لأنه كان يرى القدر.

قال: وبلغني أنه أتى المدينة فقيل لمالک: قد قَدِم ثَور، فقال: لا تأتوه، فقال: لا يجتمعُ عند رجلٍ مبتدعٍ في مسجدِ رسول الله ﷺ.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ١٣٣٧

**ربيع بن نافع** دەڵێ: هاوەڵانمان بۆیان گێڕاینەوە، وتیان: ثور بن یزید گەیشت بە الأوزاعي، ثور دەستی درێژ کرد بۆ تەوقە کردن، بەڵام الأوزاعي دەستی نەدایە، وتی: ئەی ثور، ئەگەر بابەتەکە دونیایی بووایە ئەوە نزیک بووین لە یەک، بەڵام پەیوەندی بە دینەوە هەیە! دەڵێ: بۆیە بەو جۆرە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردووە، چونکە قەدەری بووە.

حدثنا محمد بن إسماعيل، قال: حدثنا الحسن بن علي الحُلواني، قال: حدثنا الربيع بن نافع أبو تَوبة، قال: حدثنا أصحابنا، قالوا: لَقي ثَور الأوزاعي، فَمَدَّ إليه ثَورُ يده، فأبى الأوزاعي أن يَمُدَّ يده إليه، وقال: يا ثَور، إنه لو كانت الدنيا، كانت المقاربة، ولكنه الدِّين! يقول: لأنه كان قَدَريًا.

كتاب الضعفاء للعقيلي | **(١٩٦/١)**

**إسحاق بن إبراهيم** دەڵێ: پێم گەیشتووە کە الأوزاعي و ثور بن یزید لەسەر جسر بە یەک گەیشتوون، الأوزاعي پێی وت: ئەی ثور ئەگەر هەجر کردن لە دین نەبوایە، ئەوە سەلامان لێدەکردی. دەڵێ: لەبەرئەوەی ثور قەدەری بوو.

أخبرني يحيى بن عمار، أخبرنا محمد بن إبراهيم بن جناح، حدثنا إسحاق بن إبراهيم القاضي، قال: بلغني أَنَّ الأوزاعي اجتمع، وثور بن يزيد على الجسر، فقال: يا ثور! لو لا الهِجرَةَ مِنَ الدِّين، لَسَلَّمنا عليك. قال: وكان قدريًا.

ذم الكلام وأهله للهروي ا ٩٣٤

**هشام** دەڵێ: بانگی أيوب السختياني كرا هەتا مردوویەک بشوات، ئەویش لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵک چوو، کاتێک سەری مردووەکەی لادا ڕوومەتی بینی ناسییەوە، ووتی: وەرن بڕۆن بۆ لای هاوڕێکەتان من نایشۆم، چونکە بینیم لەگەڵ خاوەن بیدعەیەک هاتووچۆی دەکرد و تێکەڵاوی هەبوو لەگەڵیدا.

حدثنا محمد بن ياسين بن بشر بن أبي طاهر، قال: حدثنا أحمد بن الحسن، قال: حدثنا مخلد بن الحسين، عن هشام، عن أيوب السختياني، أنه دُعيَ إلى غسل ميتٍ، فخرج مع القومِ، فلما كشف عن وجه الميتِ عَرَفَهُ، فقال: أقبلوا قِبَلَ صاحبكم! فلستُ أُغسِّلَه، رأيتُه يُماشي صاحبَ بدعةٍ.

كتاب السنة للخلال ا ٢٣٩٠ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٥٢٥

**فضيل بن عياض** دەڵێ: ئیماندار بۆی نییە لەگەڵ هەموو کەسێک دابنیشێ کە ویستی لێبێ، لەبەرئەوەی الله ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ﴾. واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئەوانەت بینی لە ئایەتەکانمان ڕۆدەچن و خراپ قسەیان لەسەر دەکەن و گاڵتەیان پێدەکەن ڕوویان لێوەرچەرخێنە و پشتیان تێکە ئەو شوێنە جێبهێڵە هەتا واز لەو قسەیە دەهێنن و قسە لە شتێکی تردا دەکەن.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا عمران بن موسى الطوسي، قال: حدثنا أبو يزيد الفَيض، قال: قال الفُضيل: ليس للمؤمن أن يقعد مع كُلِّ مَن شاء، لأن الله ﷻ يقول: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ﴾.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٤١

# نەهی کردن لە جیدال و مونازەڕە لەگەڵ ئەهلی بیدەع

موجادەلە و مونازەڕەی ئەهلی بیدەع یەکێکە لەو دەرد و نەخۆشییانەی کە تووشی موسڵمانان بووە، ئەهلی بیدەع لە سەردەمی سەلەفدا هێندە دەرفەتیان نەدراوە هەتا بێنە مەجلس هەتا بابەتی جیدال و مونازەڕە بکەنەوە، بەڵکو سووک و زەلیل بوون، هەرکاتیش هاتبنە مەجلسێک ویستبێتیان دەم بکەنەوە، ئەوە لە لایەن ئەهلی سوننەوە وەڵام نەدراونەتەوە، وە داوایان لێکردوون ئەوێ جێ بهێڵن یاخود ئەمان هەڵدەستنەوە جێی دەهێڵن، ئەمە هەمووی بۆ ئەوە بووە خۆشیان و دەور و پشتیان و عامەی موسڵمانان بپارێزن لە شوبهە و فێڵەکانی ئەهلی بیدەع، مونازەڕە ئەو دەرفەتەیە ئەهلی بیدەع بە دوایدا دەگەڕێن بۆ دەرخستنی مەزهەبەکەیان، کاتێک کەسانێک بێن دەست بکەنە مونازەڕەی ئەهلی بیدەع ئەوە یارمەتیدەر بوون لە بڵاوکردنەوەی مەنهەج و مەزهەبە باتڵەکەیان، چونکە ئەوەی لای خەڵکی شاراوە بووە ئەمانە بەو مونازەڕەیە دەریدەخەن بۆ خەڵکی بەمەش شتانێک دەدرێ بە

گوێیەکانیاندا کە نەدەبوو بیبیستن، ئەمە یەکێکە لە گەورەترین زیانەکانی مونازەڕە.

**سفيان ابن عيينة** دەڵێ: پرسیاری شتێکم کرد لە هشام بن حجیر، وتی: دەتەوێ فێری جیدالت بکەم؟ ئەگەر پێیان وتی: نەخێر، تۆ بڵێ: بەڵێ، وە ئەگەر وتیان: بەڵێ، ئەوە تۆ بڵێ: نەخێر.

أخبرنا أبو يعقوب، أخبرنا أبو بكر بن أبي الفضل، أخبرنا أحمد بن محمد بن يونس، حدثنا عثمان بن سعيد، سمعت نعيم بن حماد، يقول: سمعت ابن عيينة، يقول: سمعت هشام بن حُجير يقول لي -وسألته عن شيء-: تريد أن أعلمك المِراء؟ إذا قالوا لک: لا، فقل: نعم، وإذا قالوا: نعم، قل: لا.

ذم الكلام وأهله للهروي | ٨٦٧

المراء واتە گومان هەبوون لە حەقیقەتی شتێک و موجادەلە و موناقەشە کردن لەسەری هەتا دەگاتە ئاستێک ئینکاری حوکمی مەسائیلەکان دەکرێ و ملکەچی نابێ، هەرچەندە بەڵگەی صحیح و صەڕیحی لەسەر هاتبێ، بەڵام ئەهلی جیدال هەر دەڵێن نەخێر وانیە.

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ هُوَ الَّذِى أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ ﴾. هەتا: ﴿ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴾. وتی: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « ئەگەر ئەو کەسانەت بینی شوێن موتەشابیهـ دەکەوتن بۆ دروست کردنی فیتنە، ئەوە بزانە ئەو کەسانەن کە الله ﷻ ناوی هێناون، بۆیە وریا و ئاگاداری خۆتبە ».

حَدَّثَنَا عَبْدُاللَّه بْنُ مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ التُّسْتَرِيُّ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: تَلَا رَسُولُ اللهِ ﷺ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ هُوَ الَّذِى أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ ﴾. إِلَى قَوْلِهِ: ﴿أُولُو الْأَلْبَابِ﴾. قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « فَإِذَا رَأَيْتِ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ فَأُولَئِكِ الَّذِينَ سَمَّى اللَّهُ، فَاحْذَرُوهُمْ ».

صحيح البخاري | ٤٥٤٧ صحيح مسلم | ٦٧٧٥ سنن أبي داود | ٤٥٩٨ سنن الترمذي | ٣٢٣٦ سنن ابن ماجه | ٤٧ مسند أحمد | ٢٦١٩٧

**أبو هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: موجادەلە کردن لە قورئان کوفرە.

حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ -يَعْنِي ابْنَ هَارُونَ- أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «**المِرَاءُ فِي الْقُرْآنِ كُفْرٌ**».

سنن أبي داود | ٤٦٠٣ مسند أحمد | ١٠٥٣٩ المصنف لابن أبي شيبة | ٣٠٧٧٧ كتاب الشريعة للآجري | ١٤١ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ١٨٢

ئەم حدیثە لای إبن أبي شيبة لە جیاتی وشەی « **المِرَاء** » وشەی «**جِدَال**» هاتووە.

**محمد بن الحنفية** دەڵێ: دونیا بە کۆتا نایەت و قیامەت بەرپا نابێ هەتا مشتومڕ و ناکۆکی خەڵکی دەگاتە سەر پەروەدگاریان.

وحدثنا محمد بن كثير العبدي، أخبرنا سفيان يعني الثوري، عن سالم يعني ابن أبي حفصة، عن يعلى، عن محمد بن الحنفية، قال: لا تنقضي الدنيا حتى تكون خصومتهم في ربهم.

كتاب الرد على الجهمية للدارمي | ٣ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٤٣ ذم الكلام وأهله للهروي | ٦١٨ جامع بيان العلم لابن عبدالبر | ١٧٨١

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: ڕق لێبووترین پیاو لای الله ﷻ ئەو کەسەیە کە زۆر توندە لە ناکۆکی و جیدال، وە شارەزایە بە ناکۆکی.

حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قال: «**إِنَّ أَبْغَضُ الرِّجَالِ إِلَى اللهِ الْأَلَدُّ الْخَصِمُ**».

صحيح البخاري | ٢٤٥٧ صحيح مسلم | ٦٧٨٠ مسند أحمد | ٢٤٢٧٧

**أبي أمامة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: « هیچ قەومێک گومڕا نەبوونەتەوە لە دوای ئەوەی لەسەر هیدایەت بوون ئیللا

تووشی جیدال هاتوون ». پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴾ .

حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بِشْرٍ الْعَبْدِيُّ، وَيَعْلَى بْنُ عُبَيْدٍ، عَنْ حَجَّاجِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ أَبِي غَالِبٍ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ إِلَّا أُوتُوا الْجَدَلَ** ». ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴾ .

سنن الترمذي | ٣٥٣٥ سنن ابن ماجه | ٤٨ مسند أحمد | ٢٢١٦٤ كتاب السنة لابن أبي عاصم | ١٠٥ الحجة في بيان المحجة لقوام السنة | ٢٢٢

**عمرو بن شعيب** لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: هەندێک کەس لای دەرگاری ماڵی ڕەسول الله ﷺ دانیشتبوون، هەندێکیان دەیانوت: مەگەر الله ﷻ ئاوا و ئاوای نەفەرمووە؟ وە هەندێکی تریان دەیانوت: مەگەر الله ﷻ ئاوا و ئاوای نەفەرمووە؟ هەندێکیان ڕەدی هەندێکی تریان دەدایەوە، ڕەسول الله ﷺ ئەمەی بیست بە تووڕەیی هاتە دەرەوە بۆیان ڕوومەتی سورهەڵگەڕابوو کەئەنەما دەنکە هەنارت بە

ڕوویدا تەقاندووە، فەرمووی: « ئایا بەمە ئەمرتان پێکراوە؟! کتابی الله هەندێکی بدەن بەگژی هەندێکی تردا، ئوممەتانی پێش ئێوە بەم جۆرە گومڕا بوون، ئێوە لەم جیدال و مشتومڕەدا هیچ شتێکتان دەست ناکەوێ، تەماشاکەن ئەوەی ئەمرم پێتان کردووە عەمەلی پێبکەن، ئەوەشی نەهیم لێتان کردووە وازی لێبهێنن و نزیکی مەکەونەوە ».

حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، حَدَّثَنَا دَاوُدُ بْنُ أَبِي هِنْدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ نَفَرًا كَانُوا جُلُوسًا بِبَابِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ كَذَا وَكَذَا؟ وَقَالَ بَعْضُهُمْ: أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ كَذَا وَكَذَا؟ فَسَمِعَ ذَلِكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَخَرَجَ كَأَنَّمَا فُقِئَ فِي وَجْهِهِ حَبُّ الرُّمَّانِ، فَقَالَ: « **بِهَذَا أُمِرْتُمْ؟ - أَوْ: بِهَذَا بُعِثْتُمْ؟- أَنْ تَضْرِبُوا كِتَابَ اللهِ بَعْضَهُ بِبَعْضٍ، إِنَّمَا ضَلَّتِ الْأُمَمُ قَبْلَكُمْ فِي مِثْلِ هَذَا، إِنَّكُمْ لَسْتُمْ مِمَّا هَاهُنَا فِي شَيْءٍ، انْظُرُوا الَّذِي أُمِرْتُمْ بِهِ فَاعْمَلُوا بِهِ، وَالَّذِي نُهِيتُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا** ».

مسند أحمد | ٦٨٤٥ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٦٣

**مجاهد** لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ﴾. دەڵێ: جیدال و خصومە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا نییە.

قال: وحدثني أبو بكر، قال: حدثنا أبو أسامة، عن شبل، عن ابن أبي نجيح، عن مجاهد: ﴿ لا حُجّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ﴾. قال: لا خصومة بيننا وبينكم.

كتاب السنة للخلال | ١٩٢٥ تفسير الطبري | **(٥٦/١٦)** تفسير مجاهد | ١٥٠٧

ئەم ئەثەرە لای **إبن جرير الطبري** بەم لەفظە هاتووە: قال: لا خصومة.

**عبدالرحمن بن زيد بن أسلم** لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ لا حُجّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ﴾. دەڵێ: الله ﷻ نەهی کردووە لە ڕەسولەکەی موجادەلە بکات، ﴿ لا حُجّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ﴾. جیدال و خصومە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا نییە.

حدثني يونس، قال: أخبرنا ابن وَهَب، قال: قال ابن زيد في قوله: ﴿ لا حُجّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ﴾. قال: نهاه الله أن يُجادِل، ﴿ لا حُجّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ﴾. لا خصومة بيننا وبينكم.

تفسير الطبري | **(٥٧/١٦)**

**أبي العالية** دەڵێ: دوو ئایەت هەن لە کتێبی الله ﷻ ئای چەندە قورسن بۆ ئەوانەی موجادەلە دەکەن لە قورئان: ﴿ مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا ﴾. ﴿ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِي الْكِتَابِ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ ﴾.

حدثنا أبو عبدالله محمد بن مخلد، وأبو شيبة عبدالعزيز بن جعفر، قالا: حدثنا أبو عبدالله محمد بن إسماعيل الواسطي، قال: حدثنا وكيع، قال: حدثنا أبو جعفر الرازي، عن الربيع بن أنس، عن أبي العالية، قال: آيتان في كتاب الله ما أشدَّهما على الذين يُجادلون في القرآن: ﴿ مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا ﴾. ﴿ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِي الْكِتَابِ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ ﴾.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٦٥

**إبراهيم الخواص** دەڵێ: زەندەقە و کوفر و بیدعە و جورئەت کردن و زمان درێژی کردن بەرامبەر دین ئیللا هۆکارەکەی هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ کەلام و جیدال و ئینکاری کردن لەسەر دین، پیاو چۆن جورئەت

دەكات موجادەلە بكات، لەكاتێكدا الله ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِي الْبِلَادِ ﴾.

وقال إبراهيم الخواص: ما كانت زندقة ولا كفر ولا بدعة ولا جرأة في الدين، إلا مِن قِبَلَ الكلام والجِدال والمِراء، وكيف يجترئ الرَّجُل على المِراء، والله تعالى يقول: ﴿ مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِي الْبِلَادِ ﴾.

الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٢٣٦

سەلەف بەو هەموو عیلم و عەقیدە صەحیحەیانەوە، بەو فەزڵ و گەورەیی و موژدەی خێرەی كە ڕەسول الله ﷺ پێی دابوون، كەچی پێیان خۆش نەبووە موجادەلە بكەن و نەهییان لێكردووە، چونكە هۆكارێكە بۆ داخستنی دەرگای فێربوون و ڕق و كینە لە دڵدا دەڕوێنێ.

كاتێک تۆ قەولی حەق بەیان دەكەیت بۆ كەسی بەرامبەر، بەڵام ئەو بە هەر هۆكارێک بێ قبوڵی ناكات و بە ئەستەمی دەزانێ وەریبگرێ، پێویست ناكات زۆر لەسەری بڕۆی، حەقەكە بڵێ وەری گرت الحمدلله، وەری نەگرت وازی لێ بهێنە، چونكە ئەوەی لەسەرت واجب بووە

گەیاندووتە، وە زیاد لەسەر ڕۆیشتنی خێری تێدا نییە و ئەو شتەیە سەلەف ڕێگرییان لێکردووە.

**الأوزاعي** دەڵێ: ئەگەر الله ﷻ بیەوێ شەڕ و خراپە تووشی قەومێک بکات ئەوە مولزەم و وابەستەیان دەکات بە جیدالەوە، وە مەنعی عەمەلیان لێدەکات مەشغوڵیان دەکات بە جیدالەوە هەتا ئەو ئاستەی عەمەلیان بیر دەچێتەوە.

أخبرنا أحمد بن عبيد، قال: أخبرنا محمد بن الحسين، قال: حدثنا أحمد بن زهير، قال: حدثنا يحيى بن معين، قال: حدثنا عثمان بن صالح، قال: حدثنا بكر بن مضر: عن الأوزاعي، قال: إذا أراد بقومٍ شرًّا ألزمهم الجَدَلَ، ومَنعهم العمل.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٩٦ جامع بيان العلم لابن عبدالبر ا ١٧٧٧ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٩٣١

**معروف الكرخي** دەڵێ: ئەگەر الله ﷻ خێری عەبدەکەی بوێ، ئەوە دەرگای عەمەلی بۆ دەکاتەوە، وە دەرگای جیدالی لێدادەخات، وە ئەگەر

شەڕی بۆ عەبدەکەی بوێ، ئەوە دەرگای جیدالی بۆ دەکاتەوە، وە دەرگای عەمەلی لێدادەخات.

حدثني أبو بكر محمد بن المُعافى البزاز، قال: حدثنا أبو يعقوب يوسف بن موسى المروروذي، قال: حدثنا عبدالله بن خُبيق، قال: حدثنا أبو إبراهيم، قال: سمعت معروفًا، يقول: إنَّ الله ﷻ إذا أرادَ بعبدٍ خيرًا، فتح له باب عمل، وأغلق عنه باب الجَدَلَ، وإذا أرادَ بعبدٍ شَرًّا، فتح عليه باب الجَدَل، وأغلَقَ عنه باب العمل.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦١٥

**سفيان بن عيينة** دەڵێ: بیستم پیاوێک لە خەڵکی بەصرە لە حسن البصري ـیەوە دەیگێڕایەوە وتویەتی: قەت نەبووە بگەم بە فەقیهێک موجادەلە بکات و نەرمی بنوێنێ بەرامبەر ئەهلی بیدەع، حیکمە و دانایی بڵاوبکەنەوە، ئەگەر لێیان وەرگرتن حەمدی الله بکەن، وە ئەگەریش ڕەتکرایەوە هەر حەمدی الله بکەن.

حدثنا أبو صالح، قال: حدثنا أبو الأحوَص. وحدثنا حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قالا: حدثنا أبو غسان مالک بن إسماعيل النهدي، قال: حدثنا ابن عيينة، قال: سمعت رجلًا مِن أهل البصرة يُذكر عن الحسن،

قال: ما أدرَكت فقيهًا قَطُّ يُماري، ولا يُداري، ينشر حكمة، فإن قُبِلَت حَمِدالله، وإن رُدَّت حَمِدالله.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٣٧

**هيثم بن جميل** دەڵێ: بە مالك بن أنس ـم وت: پیاو هەیە شارەزایە بە سوننەت موجادەلەی پێبکات؟ وتی: نەخێر، ئەوەی سوننەیە دەیگەیێنێ، ئەگەر لێی وەرگیرا باشە، ئەگەر وەریان نەگرت، ئەوە با بێدەنگ بێ.

قال الهيثم بن جميل: قلت لمالك بن أنس: يا أبا عبدالله، الرجل يكون عالمًا بالسُّنة يُجادل عليها؟ قال: لا، يُخبِرُ السُّنة، فإن قُبِلَت مِنه، وإلا أمسك.

جامع بيان العلم لابن عبدالبر | ١٧٨٤

**قتادة بن دعامة** لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾. دەڵێ: خاوەنی بیدعەیە بانگەواز بۆ بیدعەکەی دەکات.

أخبرنا الحسين بن علي بن زنجوية القطان القزويني -بالري- قال: حدثنا سليمان بن يزيد المُعَدَّل، قال: حدثنا علي بن محمد بن عبدالله بن المبارك الصنعاني، قال: حدثنا خالي عبدالله بن أبي غسان، قال: حدثنا عَرَفَة بن

إسماعيل، عن أبي إسحاق المصيصي، عن أبي العوام: عن قتادة: ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾. قال: صاحب بدعة يدعو إلى بدعته.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ١٧٨ الحجة في بيان المحجة لقوام السنة | ٢٢٣

**إبن عون** دەڵێ: محمد بن سيرين وای دەبینی ئەم ئایەتە: ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ ﴾ دەربارەی ئەهلی هەوا و ئارەزوو دابەزیوە.

حدثنا عبيدالله بن معاذ، حدثنا أبي، حدثنا ابن عون، قال: كان محمد يرى أنَّ هذه الآية نزلت في أهل الأهواء: ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ ﴾. وقرأ ابن عون حتى ختم الآية.

كتاب القدر للفريابي | ٣٧٧ تفسير ابن أبي حاتم | **(٣٨٩/٦)** الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٧١ كتاب أصول السنة لابن أبي زمنين | ٢٤٤

**مسلم بن يسار** دەڵێ: وریا و ئاگاداری خۆتان بن لە موجادەلە، چونکە ئەوە کات و سەعاتی نەزان بوون و غەڵەتی زانایە، وە شەیتان لەو کاتەدا دەستی خۆی دەوەشێنێ.

أخبرنا عفان، قال: حدثنا حماد بن زيد، قال: حدثنا محمد بن واسع، قال: كان مسلم بن يسار، يقول: إياكم والمِراء، فإنها ساعة جهل العالِم، وبها يبتغي الشيطان زَلَّته.

سنن الدارمي | ٤٠٨ كتاب القدر للفريابي | ٣٨٣ كتاب الزهد لأحمد | ١٤٠٧ كتاب البدع لابن وضاح | ١٤٩ كتاب الشريعة للآجري | ١١٢ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٧٢

**مهدي بن ميمون** دەڵێ: بیستم پیاوێک لە مەسئەلەیەکدا موجادەلەی دەکرد لەگەڵ محمد بن سيرين، محمد پێی وت: دەزانم چیت دەوێ، من لە تۆ باشتر لە جیدال دەزانم، بەڵام موجادەلەت لەگەڵ ناکەم.

حدثنا محمد بن داود، قال: حدثنا مسلم ابن إبراهيم، قال: حدثنا مهدي بن ميمون، قال: سمعت مُحمدًا -يعني ابن سيرين- ومَاراه رَجُل في شيء،

فقال له محمد: إني قد أعلم ما تُريد، وأنا أعلم بالمِراء مِنك، ولكني لا أُماريك.

كتاب القدر للفريابي ا ٣٧٩ كتاب الشريعة للآجري ا ١٣٤ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٦٤٨

**أبي بكر الآجري** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم ئەثەرەی سەرەوەی محمد بن سيرين، دەڵێ: ڕەحمەتی الله ـت لێبێ گوێت لێنەبوو لەوەی تێپەڕی و هێنامان لە قەولی أبي قلابة: « لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوو دامەنیشن، موجادەلەشە لەگەڵیان مەکەن، چونکە ئەمین نیم لێیان و ترسم هەیە بتانخەنە ناو گومڕاییەکەیان و ئەوەی خۆیان تووشی بوون لە دیندا هەندێکیشی تووشی ئێوە بکەن ». ئایا گوێت لە قەولی حسن البصري نەبووە کاتێک پیاوێک پرسیاری لێدەکات دەربارەی مەسئەلەیەک دەڵێ : « مونازەڕەم لەگەڵ دەکەیت لە دیندا؟ حسن پێی دەڵێ: من دینەکەی خۆمم دیوەتەوە و دەیناسم، ئەگەر تۆ دینەکەتت ون کردووە ئەوە بڕۆ بیدۆزەرەوە ». ئایا گوێت نەگرتووە بۆ قەولی عمر بن عبدالعزيز: « هەرکەسێک دینەکەی بکاتە ئامانجێک بۆ مشتومڕ و ناکۆکی، ئەوە زۆر

دەگوازێتەوە و زوو زوو عەقیدەی دەگۆڕێ ». هەرکەسێک ئیقتدا بکات بەو ئیمامانە دینەکەی سەلامەت دەبێ إن شاء الله.

ئەگەر کەسێک بپرسێ: ئەگەر هاتوو ڕۆژێک لە ڕۆژان پێویست بوو، وە ناچار بم بە مونازەڕە و ئیقامە حوجەیان ئایا مونازەڕەیان لەگەڵ بکەم؟ پێی دەوترێ: ناچاری و پێویست بوون بە مونازەڕە کاتێکە دەبێ کەسەکە عەقیدە و مەزهەبێکی خراپی هەبێ، خەریکی ئیمتحانی خەڵکی بێت و بانگیان بکات بۆ مەزهەبەکەی، وەک ئەوەی لە ڕابردوودا لە سەردەمی أحمد بن حنبل ڕوویدا، سێ خەلیفە هەستان بە ئیمتحانی خەڵکی بۆ مەزهەبە پیسەکەیان کە فیتنەی جەهمیەکان بوو، لێرەدا زانایان ناچار بوون ئیللا دەبوو هەستن بە دیفاع کردن لە دین، بەمەش ویستیان بە عامەی خەڵکی نیشان بدەن و حەقیان لە باتڵ بۆ ڕوون بکەنەوە، ئیدی مونازەڕیان لە بابی زەڕووریەت و ناچاری بوو نەک بە ویستی خۆیان، الله ﷻ حەقی سابت و جێگیر کرد لەگەڵ أحمد بن حنبل، هەروەها ئەوانەشی لەگەڵی بوون، وە الله ﷻ موعتەزیلەی زەلیل کرد و فەزحی کردن، وە عامەی خەڵک بۆیان دەرکەوت و زانییان حەق ئەوەیە کە أحمد لەسەریەتی و ئەوانەشی شوێنی دەکەون هەتا ڕۆژی قیامەت، وە داواکارم

لە الله ﷻ ئەهلی عیلم لە ئەهلی سوننە و جەماعە بۆ هەمیشەیی بپارێزێ لە فیتنەی لەو جۆرە.

وە دوای ئەوەش داوا دەکرێ بە حفظی سونەنی ڕەسول الله ﷺ، هەروەها سونەنی صەحابە رضي الله عنهم لەگەڵ تابعین و قەولی ئەئمەی موسڵمانان، وەک: مالک بن أنس، أبو عمرو الأوزاعي، سفیان الثوري، عبدالله بن المبارک و هاوشێوەکانیان، وە شافعي و أحمد بن حنبل و قاسم بن سلام و ئەوانەشی شوێن تەریقەی ئەم عولەمایانە کەوتوون، وە غیری ئەوان پشت گوێ دەخرێ و مونازەڕە و مشتومڕ و موجادەلەیان لەگەڵ نەکات، وە ئەگەر لە ڕێگادا خاوەن بیدعەیەکی پێگەیشت ئەوە لە ڕێگایەکی ترەوە بڕوات، وە ئەگەر ئامادەی مەجلسێک بوو موبتەدعێکی تێدا بوو ئەوە هەستێتەوە و جێی بهێڵێ، سەلەف بەم جۆرە ئامۆژگارییان کردووین.

أَلَم تسمع رحمك الله إلى ما تقدم ذكرنا له مِن قول أَبي قِلابة: « لا تُجالسوا أَهل الأَهواء، ولا تجادلوهم فإِني لا آمن أَن يغمسوكم في الضلالة، أَو يلبسوا عليكم في الدين بعض ما لُبِّس عليهم ». أَوَلَم تسمع إِلى قول الحَسَن وقد سأَله رَجُل عن مسأَلة، فقال: « تُناظرني في الدين؟

فقال له الحسن: أمَّا أنا فقد أبصرتُ ديني، فإن كنت أضللت دينك فالتمسه». أوَلَم تسمع إلى قول عمر بن عبدالعزيز: «مَن جَعَلَ دينه عَرضًا للخصومات، أكثر التَّنَقّلَ ». مَن اقتدى بهؤلاء الأئمة سَلِمَ له دينه، إن شاء الله تعالى.

فإن قال قائل: فإن اضطرني الأمر وقتاً مِنَ الأوقات إلى مناظرتهم وإثبات الحُجة عليهم ألا أناظرهم؟ قيل له: الاضطرار إنما يكون مع إمام له مذهب سوء، فيمتحِن الناس ويدعوهم إلى مذهبه، كفعل مَن مضى في وقت أحمد بن حنبل، ثلاثة خلفاء امتحَنوا الناس، ودعوهم إلى مذهبهم السوء، فلم يجد العلماء بُدًّا مِنَ الذَّبِّ عن الدِّين، وأرادوا بذالک معرفة العامة الحق مِن الباطل، فناظروهم ضَرورة لا اختيارًا، فأثبت الله تعالى الحَقَّ مع أحمد بن حنبل، ومَن كان على طريقته، وأذلَّ الله تعالى المعتزلة وفضحهم، وعَرَفَت العامة أنَّ الحق ما كان عليه أحمد ومَن تابعه إلى يوم القيامة، وأرجوا أن يعيذكم الله الكريم أهل العلم مِن أهل السُّنَّة والجماعة مِن محنَةٍ تكون أبدًا.

وبعد هذا فأمر بحفظ السُّنن عن رسول الله ﷺ وسنَن أصحابه رضي الله عنهم، والتابعين لهم بإحسان، وقول أئمة المسلمين، مثل: مالک بن

أنس، والأوزاعي، وسفيان الثوري، وابن المبارك وأمثالهم، والشافعي، وأحمد بن حنبل، والقاسم بن سلام ومَن كان على طريقة هؤلاء مِنَ العلماء، وينبذ مَن سواهم ولا يناظر ولا يجادل، ولا يخاصم، وإذا لقي صاحب بدعة في طريق أخذ غيره، وإن حضر مجلسًا هو فيه قام عنه، هكذا أدبنا مَن مضى مِن سلفنا.

كتاب الشريعة للآجري | **(٢٦٨/١)**

**عبدالله بن وهب** دەڵێ: بیستم مالک بن أنس دەیوت: قورئان ئیمامە، ئەمما ئەم جیداڵە ئەوە نازانم چییە؟!

حدثنا النيسابوري، قال: حدثنا يونس، قال: حدثنا ابن وَهَب، قال: سمعت مالكًا، يقول: القرآن هو الإمام، فأمَّا هذا المِراء فلا أدري ما هو؟!

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦١٦

**بلال بن سعد** دەڵێ: ئەگەر پیاوێکت دی زۆر لەسەر شت ڕۆیشت، ئەهلی موجادەلە بوو، سەرسام بوو بە ڕەئی خۆی، ئەوە بە خەسارەت چووە.

حدثنا أبو إسحاق إبراهيم بن حماد القاضي، قال: حدثنا أبو نصر فتح بن شخرف، قال: قرأت على العباس بن الوليد البيروتي، قال: أخبرني أبي، قال: حدثنا الأوزاعي، قال: سمعت بلال بن سعد، يقول: إذا رأيت الرَّجُلَ لَجوجًا مُماريًا مُعجَبًا برأيه، فقد تَمَّت خسارته.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦١٧

**فضيل بن عياض** دەڵێ: سفيان الثوري هەركات كەسێكى بينيبا موجادەلەی بكردایە، دەیوت: بە ڕەبی كەعبە ئەمە وەک أبو حنيفة ـيە.

حدثنا إبراهيم بن حماد، قال: حدثنا أبو نصر فتح بن شخرف، قال: أخبرني أبو الحسن المروزي، قال: حدثنا إبراهيم بن الأشعث، عن فُضَيل، قال: كان سفيان إذا رأى إنسانًا يُجادِلُ ويُماري، يقول: أبو حنيفة وَرَبِّ الكعبة.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦١٩

**محمد بن علي ابن الحنفية** دەڵێ: لەگەڵ ئەصحابی مشتومڕ و ناكۆكی دامەنیشن، چونكە ئەوانە ڕۆدەچن لە ئایەتەكانی الله ﷻ وە خراپ قسە دەكەن دەربارەیان.

حدثنا القافُلائي، قال: حدثنا محمد بن إسحاق، قال: حدثنا إسحاق بن منصور، قال: حدثنا حفص بن غياث، عن ليث بن أَبي سليم، عن مُنذر الثوري، عن محمد بن علي ابن الحنفية، قال: لا تُجالسوا أَصحاب الخصومات، فإنهم الذين يخضون في آيات الله.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٧٨

**عمرو بن قيس** دەڵێ: وتم بە حكم بن عتيبة: چی پاڵنەر بوو بۆ خەڵكی شوێن ئەهلی هەوا و ئارەزوو كەوتوون؟ وتی: مشتومڕ و ناكۆكی.

قال: وحدثني أَبو بكر، قال: حدثنا معاوية بن هشام، قال: عن عمرو بن قيس، قال: قلت للحَكَم: ما اضطَرَّ إلى هذا؟ قال: الخصومة.

كتاب السنة للخلال | ١٩٢٤ كتاب الشريعة للآجري | ١٢٤ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٨٢ ذم الكلام وأَهله للهروي | ٨٦٣

ئەم ئەثەرە لای **الآجري** و **إبن بطة** بەم لەفظە هاتووە: ما اضطَرَّ الناس إلى الأهواء؟ قال: الخصومات.

وە لای **الهروي** بەم لەفظە هاتووە: ما اضطَرَّ المرجئة إلى رأَيهم؟ قال: الخصومات.

وتم: ئەوە کێشەی هەموو گرووپەکانی تریشە بە هۆی ئینکاری و حەزیان بۆ مشتومڕ و جیدال و موناقەشەی بێ مانا کەوتوونەتە ئەو مەزهەبە باتڵەی کە تیایدان.

**إبراهيم النخعي** دەربارەی ئایەتی: ﴿فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ﴾. دەڵێ: مشتومڕ و جیدال لە دیندا.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا سُريج بن يونس، قال: حدثنا محمد بن يزيد، قال: حدثنا العوام بن الحَوشب، عن إبراهيم في قوله: ﴿ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ ﴾. قال: الخصومات والجِدال في الدين.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٨٥ جامع بيان العلم لابن عبدالبر | ١٧٧٢ ذم الكلام وأهله للهروي | ٨٤٠

**هشام بن حسان** دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای حسن البصري، وتی: ئەی باوکی سعید، وەرە با مشتومڕت لەگەڵ بکەم لە دیندا؟ حسن وتی: من دینەکەی خۆمم دیوەتەوە و دەیناسم، ئەگەر تۆ دینەکەتت ون کردووە ئەوە بڕۆ بیدۆزەرەوە.

حدثنا محمد بن داود، حدثني محمد بن عيسى، حدثني مَخلَد، عن هِشام، قال: جاء رجُل إلى الحسن، فقال: يا أبا سعيد، تعال حتى أُخاصمك في الدين! فقال الحسن: أما أنا فقد أبصرت ديني، فإن كنت أضللتَ دينك، فالتمسه.

كتاب القدر للفريابي | ٣٨٠ كتاب الشريعة للآجري | ١١٨ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦١٢ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢١٥

ئەم ئەثەرە لای **اللالكائي** بەم لەفظە هاتووە: عن حَوشَب: عن الحسن أَنَّ رجلًا أتاه، فقال: يا أبا سعيد إني أُريد أن أُخاصمك، فقال الحسن: إليك عني فإني قد عرفت ديني وإنما يخاصمك الشاكُّ في دينه.

**مالك بن أنس** دەڵێ: پیاوێک هەبوو هەرکات کەسانێک لە ئەهلی هەوا و ئارەزوو بچوونایە بۆ لای، دەیوت: من لە دینی پەروەردگارم بەرچاو ڕوونم، ئەمما تۆ ئەوە گومانت هەیە، بڕۆ بۆ لای کەسێک وەک خۆت گومانی هەبێ لە دینی مشتومڕی لەگەڵ بکە.

حدثنا القافُلائي، قال: حدثنا محمد بن إسحاق، قال: أخبرني أصبغ بن الفرج، قال: أخبرني ابن وَهَب، قال: سمعت مالكًا، يقول: كان ذالك

الرَّجل إذا جاءه بعضُ هؤلاء أصحابِ الأهواء، قال: أَمَّا أنا فعلى بَيِّنةٍ مِن ربي، وأَمَّا أَنت فَشَاكٌّ، فاذهب إلى شَاكٍّ مثلِكَ فخاصمه.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦١٣

**شافعي** دەڵێ: مالك بن أنس هەركات كەسێک لە ئەهلی هەوا و ئارەزوو بهاتایە بۆ لای، پێی دەوت: من بەرامبەر بە پەروەدگارم و دینەکەی بەرچاو ڕوونم، ئەمما تۆ ئەوە گومانت هەیە، بڕۆ بۆ لای کەسێک وەک خۆت گومانی هەبێ لە دینی مشتومڕی لەگەڵ بکە.

حدثنا الحسن بن سعيد بن جعفر، حدثنا زكريا بن يحيى الساجي، حدثنا أبو داود، حدثنا أبو ثَور، قال: سمعت الشافعي، يقول: كان مالك بن أنس إذا جاءه بعض أهل الأهواء، قال: أَمَّا إني على بَيِّنةٍ مِن ربي وديني، وأَمَّا أنت فَشَاكٍ إلى شَاكٍ مثلِكَ فخاصمه.

حلية الأولياء لأبي نعيم | ٨٩٣٢

**مالك بن أنس** دەڵێ: پیاوێک وتی: من چوومە ناو هەرچی دینەوە هەیە، بەڵام هیچ شێتکی ڕێک و ڕاستم لێیان نەدی! پیاوێک لە قسە زانەکانی مەدینە پێی وت: من پێتی دەڵێم بۆ وایە، لەبەرئەوەی تۆ تەقوای

الله ـت نییە، ئەگەر تەقوای الله ـت هەبووایە، ئەوە لەو ئەمرەی تێی کەوتووی ڕزگاری دەکردی و دەروویەکی لێدەکردیتەوە.

حدثنا القافُلائي، قال: حدثنا الصَّاغاني، قال: أَخبرني أَصبغ بن الفرج، قال: أَخبرني ابن وَهَب، قال: سمعت مالكًا، يقول: قال رَجُلٌ: لقد دَخلت في هذه الأَديانِ كُلِّها، فلم أَرَ شَيئًا مُستقيمًا! فقال رَجُل مِنَ المدينة مِنَ المُتَكلِّمين: فأَنا أُخبرك لِمَ ذالك، لأَنك لا تتقي الله، فلو كنت تتقي الله جَعَلَ لك مِن أَمرك مَخرجًا.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦١٤

**أيوب السختياني** دەڵێ: پێنازانم یەکێک هەبێ لە ئەهلی هەوا و ئارەزوو ئیللا دەچن و دەگەڕێن بە دوای موتاشابیهدا بۆ ناکۆکی و مشتومڕ.

حدثنا أَبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أَبو حاتم، قال: حدثنا عيسى بن يونس الرملي، قال: حدثنا مؤمل، عن حماد بن زيد، قال: سمعت أَيوب، يقول: لا أَعلم أَحدًا مِن أَهل الأَهواء يُخاصم إلا بالمُتشابه.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٨٧

**معاوية بن قرة** دەڵێ: مشتومڕ و ناکۆکی لە دیندا کردەوەکان بەتاڵ دەکەنەوە.

حدثنا عمر بن أيوب السقطي، قال: حدثنا عثمان بن أبي شيبة، قال: حدثنا هُشيم بن بشير، عن العوام بن حَوشَب، عن معاوية بن قُرَّة، قال: الخصومات في الدِّين تُحبِط الأعمال.

كتاب الشريعة للآجري ا ١١٥ الابانة الكبرى لابن بطة ا ٥٨٨ جامع بيان العلم لابن عبدالبر ا ١٧٧٣ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٢١ الحجة في بيان المحجة لقوام السنة ا ٢٢٨

ئەم ئەثەرە لای **اللالكائي** و **قوام السنة** بەم لەفظە هاتووە: إياكم وهذه الخصومات، فإنها تُحبط الأعمال.

وتم: مصداقی ئەم قەولە کەلامی اللە یە ﷻ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللهِ وَشَاقُّوا الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى لَن يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئًا وَسَيُحْبِطُ أَعْمَالَهُمْ ﴾. محمد : ٣٢

بشر بن الحارث دەڵێ: مشتومڕ و ناکۆکی کردەوەکان بەتاڵ دەکەنەوە.

حدثنا أبو عبدالله محمد بن مخلد، قال: حدثنا أبو جعفر محمد بن المثنى، قال: سمعت أبا نصر بشر بن الحارث، يقول: الخصومات تُحبِط الأعمال.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٧٥

لەوانەیە بپرسن بڵێن: باشە بۆچی سەلەف وتوویانە: مشتومڕ و جیدال کردەوەی ئینسان بەتاڵ دەکەنەوە، ئایا هێندە مەترسیدارە؟!

لە وەڵامدا دەڵێم: بەڵێ، هێندە مەترسیدارە، چونکە ئەو کەسەی خەریکی جیدال و مشتومڕ و ناکۆکییە لەسەر هەموو بابەتێکی عەقیدەیی کە لە شەرعدا هاتووە قسە دەکات، لەکاتێکدا بە پێی قورئان و سوننەت جێگیر بووە، سەلەف لە صەحابە و تابعین و ئەتباعی تابعین و دوای ئەوانیش هەموو یەک دەنگ بوون لەسەری، هەموویان لە ئاستیدا تەسلیم بوون، بەڵام کەسێک دێ ڕێگا بە خۆی دەدات و میمبەری جیدال و مشتومڕ بۆ خۆی دروست دەکات قسە لە هەموو شتێکی دین دەکات، وای لێدێ ئەو بابەتانەی لە زەڕووریاتی دیندان ئەم سڵ ناکاتەوە لێیان و جیدال لەوانەشدا دەکات! هەتا دەگاتە ئەو ئاستەی گومانی لە ئوصولیاتی دین بۆ دروست دەبێت و ئەوەی حەقە ڕەتیدەکاتەوە، ئەوەشی

باتڵە وەک حەق دەیبینێ و دەیناسێنێ، ئا ئەمەیە زیانی جیدال و خصومات کە سەلەف سەدان قەولیان هەیە هەڕەشەیە لەسەر ئەهلی جیدال.

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: دوو پیاو کۆنەبوونەتەوە و مشتومڕ لە دیندا بکەن، لە یەک جیانابنەوە هەتا درۆ لەسەر الله ﷻ هەڵدەبەستن.

وحدثنا القافُلائي، قال: حدثنا الصَّاغاني، قال: حدثنا أبو بكر بن أبي شيبة، قال: حدثنا وكيع، عن داود بن سوار، عن عطاءٍ، عن ابن عباس رضي الله عنهما، قال: ما اجتمع رَجُلان يختصمان فافترقا حتى يفتريا على الله ﷻ.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٣٩

**حارث العكلي** دەڵێ: ئەگەر دوو پیاو دانیشتن ناکۆکی و مشتومڕیان بێ لە دیندا، ئەوە با بزانن خەریکی بیدعەن هەتا لە یەک جیادەبنەوە.

حدثنا الحسن بن عبدالوهاب، قال: حدثنا إسماعيل بن يوسف الديلمي، قال: حدثنا شريح، قال: حدثنا ابن أبي غنيَّة، عن أبيه، عن الحارث

العُكلي، قال: إذا جلس الرجلان يختصمان في الدِّين فليعلما أنهما في أمرِ بدعةٍ حتى يفترقا.

كتاب السنة للخلال | ٢٣٩٢ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٤٠

**أحمد بن يونس** دەڵێ: من گوێم گرت بوو پیاوێک بە سفیان الثوري وت: ئەی باوکی عبدالله ئامۆژگاریم بکە. وتی: ئاگاداری خۆتبە لە هەوا و ئارەزوو، وە لە ناکۆکی و مشتومڕ، هەروەها ئاگاداری خۆتبە لە سوڵتان و فەرمانڕەوا.

حدثني محمد بن علي الجوزجاني، أخبرنا أحمد بن يونس، قال: قال رجل لسفيان وأنا أسمع: يا أبا عبدالله، أوصِني. قال: إياكَ والأهواء والخصومة، وإياك والسلطان.

مسند ابن الجعد | ١٨١٩ الاعتصام بالعزلة للخطابي | صـ : ١٣٨

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٥٤ ذم الكلام وأهله للهروي | ٩١٠ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي | ٣٢٥

وتم: ئەهلی سوننە و خاوەنی سوننە مشتومڕ و موجادەلە ناکەن، هەتا ئەگەر لەسەر حەقیش بن، ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: « من دەبمە

زەمانی خانوویەک لە کەناری بەهەشت بۆ هەرکەسێک کە واز لە جیدال و ئینکاری بهێنێ تەنانەت ئەگەر لەسەر حەقیش بێ ... ».

حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُثْمَانَ الدِّمَشْقِيُّ أَبُو الْجُمَاهِرِ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو كَعْبٍ أَيُّوبُ بْنُ مُحَمَّدٍ السَّعْدِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ حَبِيبٍ الْمُحَارِبِيُّ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **أَنَا زَعِيمٌ بِبَيْتٍ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْمِرَاءَ وَإِنْ كَانَ مُحِقًّا** ... ».

سنن أبي داود ا ٤٨٠٠

**یعقوب بن عبدالرحمن** لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: عون بن عبدالله دەڵێ: لە هیچ شتێکدا دەست پێشخەر مەبە لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوودا، وە دەرگای هیچ بابەتێک مەکەوە لێیان، ئەوانە بەشێکی قورئان دەدەن بەگژی بەشێکی تریدا.

**یعقوب** دەڵێ: وە وتراوە: هەرکات دەرگای گومڕایی بەسەر هەر قەومێکدا کرابێتەوە، ئەوە الله ﷻ دەگاری موجادەلە و ناکۆکی بە ڕوویاندا کردووەتەوە.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا هارون بن سعيد الأيلي، قال: حدثنا ابن وهب، قال: أخبرني يعقوب بن عبدالرحمن، عن أبيه، قال: قال عَون بن عبدالله: لا تُفاتح أصحاب الأهواء في شيء، فإنهم يضربون القرآن بعضه ببعض.

قال يعقوب: ويقال: ما فتح على قومٍ باب ضلالة إلا فتح الله عليهم فيه باب جَدَل.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٥٠

**مالک بن أنس** دەڵێ: سلیمان بن یسار هەرکات لە مەجلسێکدا موجادەلەی ببیستایە، هەڵدەستایەوە و جێی دەهێشتن.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا عبدالعزيز بن عبدالله الأويسي، قال: حدثنا مالک، قال: کان سليمان بن يسار إذا سَمِعَ في مجلسٍ مِراءً، قام وترکهم.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٥١

**جبير بن نفير** دەڵێ: بە درۆ خستنەوەی قەدەر شیرکە بەسەر ئەهلی گومڕاییدا کراوەتەوە، موجادەلەیان لەگەڵ مەکەن نەوەک شیرکەکەیان لەسەر دەستی ئێوە ڕووبدات.

حدثنا حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا يحيى بن صالح الوَحَّاظي، قال: حدثنا سعيد بن سنان، عن أبي الزاهرية، عن جُبير بن نُفير، أنه كان يقول: إنَّ التكذيب بالقدرِ شِركٌ فُتِحَ على أهل الضَّلالة، فلا تُجادلوهم فيجري شركهم على أيديكم.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٥٢

**أبو ظلال القسملي** دەڵێ: پرسیارم کرد لە أنس بن مالک رضي الله عنه: ئایا هاوەڵانی ڕەسول اللە ﷺ باسی قەدەریان دەکرد؟ وتی: هیچ شتێک نەبوو هێندەی ناکۆکی و مشتومڕ ڕق لێبوو بێت لایان، وە هەرکات شتێک لەو جۆرە لایان باس بکرایە، جلەکانیان دەتەکاند و هەڵدەستانەوە و جێیان دەهێشت.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا دُحَيم، قال: حدثنا مروان بن معاوية، قال: حدثنا أبو ظِلال القَسمَلي، قال:

سألت أنس بن مالک رضي الله عنه: هل كان أصحاب رسول الله ﷺ يذكرون القدر؟ قال: إنه لم يَكُ شيء أكره إليهم مِن الخصومات، وكانوا إذا ذُكِرَ لهم شيء مِن ذالک نفضوا أرديتهم وتفرَّقوا.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٥٥

له **يحيى بن سعيد** ـەوە: أبا الزبير بۆی گێڕاوەتەوە وتویەتی: لەگەڵ طاووس طەوافمان دەکرد بە دەوی کەعبەدا، معبد الجهني تێپەڕی، کەسێک بە طاووس ـی وت: ئەوە معبد الجهني ـیە کە قسە لە قەدەردا دەکات، طاووس چوو بۆ لای، هەتا لە سەر سەری ڕاوەستا، وتی: ئەوە تۆی بوختان دەکەی بە الله ﷻ؟ لەسەر الله ﷻ شتانێک دەڵێی کە نایزانی و عیلمت پێی نییە؟ معبد وتی: درۆم بە دەمەوە دەکرێ و هەڵدەبەسترێ، أبو الزبير دەڵێ: لەگەڵ طاووس هات هەتا چووینە لای إبن عباس رضي الله عنهما، طاووس وتی: ئەی باوکی عباس، چی دەڵێی دەربارەی ئەوانەی قسە لەسەر قەدەر دەکەن؟ إبن عباس وتی: یەکێکیانم نیشان بدەن؟ پێیان وت: چیدەکەی؟ وتی: دەستم دەخەمە سەریەوە، پاشان ملی دەشکێنم.

حدثني أبي، حدثنا يزيد بن هارون، أخبرنا يحيى بن سعيد: أنَّ أبا الزبير أخبره: أنه كان يطوف بالبيت مع طاووس، فَمَرَّ بمَعبد الجُهني، فقال قائل لطاووس: هذا مَعبد الجُهني الذي يقول في القدر، فَعَدَل إليه طاووس، حتى وَقَفَ عليه، فقال: أنت المفتري على الله عَزَّ وَجَلَّ؟ القائل على الله ما لا تَعلَم؟ قال مَعبد: يُكذب عَلَيَ، قال أبو الزبير: فعدل مع طاووس حتى دخلنا على ابن عباس، فقال له طاووس: يا أبا عباس، الذين يقولون في القدر؟ قال ابن عباس: أروني بعضهم، قلنا: صانع ماذا؟ قال: إذًا أجعَل يَدي في رأسه، ثم أَدُقُّ عُنُقَه.

كتاب السنة لعبدالله | ٨٩٥ كتاب القدر للفريابي | ٢٦٤ كتاب الشريعة للآجري | ٤٥٢ الإبانة الكبرى لابن بطة | ١٧٤٨ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ١٣٢٢

**إبراهيم النخعي** دەڵێ: لە ژیانمدا هەرگیز ناکۆکی و مشتومڕم نەکردووە.

حدثنا حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا سعيد بن سليمان، قال: حدثنا حماد بن سلمة، قال: حدثنا سفيان، عن الحسن بن عمرو، عن إبراهيمٍ، قال: ما خاصَمتُ قَطُّ.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٥٦

**عبدالكريم الجزري** دەڵێ: هەرگیز نەبووە کەسی وەرع ناکۆکی و مشتومڕ بکات.

حدثنا حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا ابن الطَّبَّاع، قال: حدثنا مروان بن شجاع، عن عبدالكريم، قال: ما خاصَمَ وَرِعُ قَطُّ.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٦٥٩

**جعفر بن محمد** دەڵێ: ئاگادار بن لە ناکۆکی و مشتومڕ لە ديندا، چونکە نیفاق دەڕوێنێ لە دڵدا.

حدثنا الحسن بن عبدالوهاب، قال: حدثنا منصور بن أبي مزاحم، قال: حدثني عنبسة، قال: عن جعفر بن محمد، يقول: إياكم والخصومة في الدِّين، فإنها وتُورث النِّفاق.

كتاب السنة للخلال ا ٢٣٩٣ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٦٦٠ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢١٩

ئەم ئەثەرە لای **إبن بطة** و **اللالكائي** بەم لەفظە هاتووە: إياكم والخصومة في الدِّين، فإنها تُشغِل القلب، وتُورث النِّفاق.

**خالد بن الحارث الهجيمي** دەڵێ: ئاگاداری خۆتان بن لە ئەصحابی جیدال و مشتومڕ، چونکە ئەوانە خراپترینی ئەهلی قیبلەن.

أخبرنا عمر بن إبراهيم، حدثنا محمد بن أحمد الأزهري، حدثنا يعقوب بن إبراهيم البزار -ببغداد- حدثنا الحسن بن عرفة، سمعت خالد بن الحارث الهُجَيمي، يقول: إياكم وأصحاب الجِدال، والخصومات، فإنهم شِرار أهلِ القبلة.

ذم الكلام وأهله للهروي | ١٠٨٤

**عمران القصير** دەڵێ: ئاگاداری خۆتان بن لە دەمەقاڵێ و مشتومڕ، وە ئاگاداری خۆتان بن لەو کەسانەی کە دەڵێن: ڕات چییە، ڕات چییە.

حدثنا أبو إسحاق إبراهيم بن حماد، قال: حدثنا أبو موسى محمد بن المثنى، قال: حدثنا حماد بن مسعدة، قال: كان عمران القَصير، يقول: إياكم والمُنازعة والخصومة، وإياكم وهؤلاء الذين يقولون: أرأيت، أرأيت.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٦٢

**عبدالصمد بن معقل** دەڵێ: بیستم وهب بن منبە دەیوت: واز لە جیدال بهێنە، چونکە لە دوو کەس تێناپەڕی: پیاوێک لە تۆ شارەزاترە، دەی چۆن

لەگەڵ کەسێک موجادەلە دەکەی لەکاتێکدا لە تۆ شارەزاترە؟! وە پیاوێک تۆ لەو شارەزاتری، دەی چۆن لەگەڵ کەسێک موجادەلە دەکەی لەکاتێکدا تۆ لەو شارەزاتری، وە گوێڕایەڵیشت نابێ؟! کەواتە واز لەمە بهێنە و لە خۆتی دابڕێنە.

حدثنا الحسين بن إسماعيل أبو عبدالله القاضي المَحَامِلي، قال: حدثنا زُهير بن محمد، قال: حدثنا أبو حذيفة الصنعاني، قال: حدثني عبدالصمد بن معقل، قال: سمعت وَهَبًا، يقول: دَعِ المِراء، فإنك لا تعجز أَحَدَ رَجُلين: رَجُلٌ هو أعلم مِنكَ، فكيف تُماري وتُجادل مَن هو أعلم مِنك؟! ورَجُلٌ أنت أعلم مِنه، فكيف تُماري وتُجادل مَن أعلم مِنه، ولا يُطيعُك؟! فاقطع ذالك عنك.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٦٣

**عمرو بن مهاجر** دەڵێ: عمر بن عبدالعزيز دەیوت: هەرکات موجادەلەت بیست ئەوە وازی لێبهێنە و نزیکی مەبەوە.

حدثنا أبو القاسم عبدالله بن محمد بن إسحاق المروزي، قال: حدثنا الحسن بن عرفة، قال: حدثنا إسماعيل بن عياش، قال: حدثنا عمرو بن مهاجر، أنَّ عمر بن عبدالعزيز، كان يقول: إذا سمعتَ المِراء فأقصِر.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٦٩

**ميمون أبي عمر** دەڵێ: عەبد ناگاتە حەقیقەتی ئیمان هەتا وازنەهێنێ لە موجادەلە تەنانەت با لەسەر حەقیش بێ.

حدثنا أبو صالح، قال: حدثنا الحسن بن عليل العَنَزي، قال :حدثنا عباس بن عبدالعظيم، قال: حدثنا مؤمل، قال: حدثنا سفيان، قال: حدثنا حبيب، عن ميمون أبي عمر، قال: لا يُصيبُ عبدٌ حقيقة الإيمان حتى يَدَع المِراء وإن كان مُحِقًا.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٧٠

**عبدالرحمن بن مهدي** دەڵێ: گەیشتووم بە خەڵکی خەریکی ناکۆکی و مشتومڕ نەدەبوون.

قال عبدالرحمن بن مهدي: أدركت الناس وهم على الجُمَل -يعني: لا يتكلمون أي لا يُخاصمون.-

كتاب العلل ومعرفة الرجال لأحمد | **(١٤٤٧/٢)** الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٧٣

مەبەستی ئەوەیە قەت نەگەیشتووە بە ئەهلی سوننە خەریکی موجادەلە و موشتومڕ بن.

**إبن عون** دەڵێ: بیستم محمد بن سیرین ڕێگری دەکرد لە جیدال ئیللا مەگەر بۆ کەسێک ئەگەر قسەی لەگەڵ بکەی ئومێدت پێی هەبێ بگەڕێتەوە.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا أبو الربيع الزهراني، قال: حدثنا حماد بن زيد، قال: حدثنا ابن عَون، قال: سمعت محمد بن سيرين ينهى عنِ الجِدالِ إلا رَجُلًا إن كلَّمته يرجع.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٧٤

**مالک بن أنس** دەڵێ: موجادەلە لە عیلمدا: دڵ توند و ڕەق دەکات، وە ڕق و کینە لە دڵدا دەڕوێنێ.

حدثني أبو صالح، قال: حدثنا أبو الأحوَص، قال: حدثنا سليمان بن داود، قال: حدثنا ابن وهَب، قال: سمعت مالک بن أنس، يقول: المِراء في العلم: يُقسي القلب، ويورثُ الضَّغَن.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٧٨

**عبدالله بن الحسين** دەڵێ: جیدال هاوڕێیەتی کۆن تێک دەدات، گرێ پتەوەکان هەڵدەوەشێنێتەوە، کەمترین زیانی ئەوەیە: لایەنی بەزیوی تێدایە، وە بەزیویەتی بەهێزترین هۆکارە بۆ بچڕانی پەیوەندی.

حدثنا أبو محمد عبيدالله بن عبدالرحمن السُّكري، قال: حدثنا أبو يعلى زكريا بن يحيى المنقري، قال: حدثنا الأصمعي، قال: حدثنا سفيان، قال: قال عبدالله بن الحسين: المِراء يُفسدُ الصَّداقة القديمة، ويَحلُّ العُقدةَ الوثيقة، وأَقَلُّ ما فيه: أن تكون المُغالبة، والمُغالبة أمتَنُ أسباب القطيعة.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٨٠

**يحيى بن آدم** دەڵێ: سفيان الثوري و شريک النخعي و حسن بن صالح بن حيٍّ الهمداني وتيان: گەیشتووین بە أبو حنيفة، نەدەناسرا بە هیچ شتێک لە فقهـ، نەدەناسرا ئیللا بە ناکۆکی و مشتومڕ نەبێ.

حدثني أحمد بن محمد، قال: حدثنا يحيى بن آدم، حدثنا سفيان، وشَريک، وحسن بن صالح بن، قالوا: أدركنا أبا حنيفة، وما يُعرف بشيءٍ مِنَ الفقه، ما يُعرف إلا بالخصومات.

كتاب السنة لعبدالله | ٣٤٦ تاريخ بغداد للخطيب | **(٤٠٧/١٣)** ذم الكلام وأهله للهروي | ١٠١٣

**يحيى بن آدم** دەڵێ: بیستم شريک بن عبدالله دەیوت: أبو حنيفة خاوەنی ناکۆکی و مشتومڕ بوو، نەدەناسرا ئیللا بە ناکۆکی و مشتومڕ نەبێ.

وە بیستم: أبا بكر بن عياش دەیوت: أبو حنيفة خاوەنی ناکۆکی و مشتومڕ بوو، نەدەناسرا ئیللا بە ناکۆکی و مشتومڕ نەبێ.

حدثنا محمد بن إسماعيل الترمذي، قال: حدثنا الحسن بن علي، قال: حدثنا يحيى، قال: سمعت شَريكًا، يقول: إنما كان أبو حنيفة صاحب خصومات، لم يكن يُعرف إلا بالخصومات. وسمعت أبا بكر بن عياش، يقول: كان أبو حنيفة صاحب الخصومات، لم يكن يُعرف إلا بالخصومات.

كتاب الضعفاء للعقيلي | **(١٤٠٨/٤)**

**أبي إسماعيل الأنصاري الهروي** دەڵێ: بیستم باوکم دەیوت: أبا سعد الزاهد ـم بینی هات بۆ حەلقەی مونازەڕە لە مزگەوتی گەورە ناعلەکانیشی

بە دەستیەوە بوو، وتی: هەستن جێی بهێڵن، جیدال لە دیندا نییە. وە لە حەلقەکەدا أبو منصور الحاکم ئامادە بوو.

وسمعت أبي، يقول: رأيت أبا سعدٍ الزاهد الهَروي جاء إلى حلقة المُناظرة في الجامع ونَعلُه بيده، وقال: قوموا، ليس في الدِّين جِدال. قال: وفي الحلقة أبو منصور الحَاكِم.

ذم الكلام وأهله للهروي | ١٢٩٧

**العباس بن غالب الهمداني** دەڵێ: بە أحمد بن حنبل ـم وت: ئەی باوکی عبدالله، لە مەجلسێکدا بم هیچ کەسێک نییە بێجگە لە من شارەزا بێ بە سوننە، کەسێکی موبتەدع قسە بکات، ئایا ڕەدی بدەمەوە؟ وتی: نەفسی خۆت هەڵمەبژێرە بۆ ئەو کارە. وتی: سوننە بگەیەنە مشتومڕ مەکە، پرسیارەکەم دووبارە کردەوە، وتی: ناتبینم ئیللا کەسێکی ئەهلی مشتومڕی.

قال العباس بن غالب الهمداني الوراق: قلت لأحمد بن حنبل: يا أبا عبدالله، أكون في المجلس ليس فيه مَن يُعرِف السُّنة غيري، فيتكلم مُبتدع فيه، أَرُدُّ عليه؟ فقال: لا تُنَصِّب نفسك لهذا. قال: أَخبر بالسُّنة ولا تُخاصِم. فأَعَدتُ عليه القول، فقال: ما أراكَ إلا مُخاصِمًا.

طبقات الحنابلة لابن أبي يعلى | **(٢٣٣/١)**

**إسحاق بن عيسى الطباع** دەڵێ: بينيم مالک بن أنس بە عەيبە و خراپە ناوی ناکۆکی و مشتومڕی دەهێنا لە ديندا، وتی: هەرکات پياوێک هات لە پياوێکی تر شارەزاتر لە مشتومڕدا لێمانی ويستووە واز لەوە بهێنين کە جبريل هێناويەتی بۆ ڕەسول اللە ﷺ.

حدثنا إسحاق بن عيسى الطباع، قال: رأيت مالک بن أنس يعيب الجدال والمِراء في الدين، قال: أفكلما كان رَجُل أجدَلُ مِن رَجُل أردنا أن نرد ما جاء به جبريل إلى النبي ﷺ.

العلل ومعرفة الرجل لأحمد | **(١٥٨٥/٢)** تعظيم قدر الصلاة للمروزي | ٧٣١ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٠٨ حلية الأولياء لأبي نعيم | ٨٩٣٠ الفقيه والمتفقه للخطيب | ٦٠٢ شرف أصحاب الحديث للخطيب | ١ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٩٣ ذم الكلام وأهله للهروي | ٨٦٩ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي | ٢٢٢

ئەم ئەثەرە لای **أبي نعيم** و **اللالكائي** بەم لەفظە هاتووە: قال مالک بن أنس: كُلَّما جاءنا رَجُل أجدَلُ مِن رَجُل، تركنا ما نزل به جبريل على محمد ﷺ لِجَدَلِه؟!

**أبي بكر الآجري** پێش ڕیوایەت کردنی ئەم ئەثەرەی خوارەوەی **أيوب السختياني** دەڵێ: ئەگەر کەسێک وتی: ئەگەر هاتوو پیاوێک الله ﷻ علمێکی پێدابێ، وە پیاوێک بێت بۆ لای پرسیارێکی لێبکات لە بابەتێکی دیندا، دەمەقاڵێ و مشتومڕی لەگەڵ بکات، وای دەبینی ڕێ پێدراوە مونازەڕەی لەگەڵ بکرێ ڕەدی بدرێتەوە هەتا بیانووی ببڕدرێ؟ ئەو کەسە پێی دەوترێ: ئەمە ئەو شتەیە ڕێگریمان لێی کراوە، وە ئەئمەی موسڵمانان ئێمەیان ئاگادار کردووەتەوە لێی. ئەگەر کەسێک بڵێ: ئەی باشە چی بکەین؟ پێی دەوترێ: ئەگەر ئەو کەسەی پرسیارت لێدەکات، پرسیارەکەی هی فێربوون بوو بیەوێ بگات بە حەق، نەک بە نیازی موناظەڕە، ئەوە بە شێوازێکی نەرم و ڕوون ڕێنمونی بکە بە پێی قورئان و سوننە و قەولی صەحابە و قەولی ئەئمەی موسڵمانان رضي الله عنهم، وە ئەگەر هاتوو ویستی موناظەڕ و موجادەلەت لەگەڵ بکات، ئەمە ئەوەیە زانایان بە کەراهەتیان بینیوە، موناظەڕەی لەگەڵ مەکە، ئاگاداری دینی

خۆتبە، هەروەک چۆن سەلەف لە ئەئمەی موسڵمانان وایان وتووە ئەگەر تۆ شوێنکەوتەیانی ئەوە مونازەڕە و موجادەلە مەکە. وە ئەگەر کەسێک بڵێ: ئایا وازیان لێبهێنین خەریکی قسەکردن بن لە باتڵەکەیان، وە بێدەنگ بین لەسەریان؟ پێی دەوترێ: بێدەنگ بوونت بەرامبەریان و هەجر کردنی ئەوەی لێی دەدوێن، قورسترە لەسەریان هەتا مونازەڕە کردنت لەگەڵیان، سەلەفی صاڵح لە زانایانی موسڵمانان بەم جۆرەیان وتووە و ئامۆژگارییان کردووین.

فإن قال قائل: فإن كان رَجُل قد علمه الله تعالى علمًا، فجاءه رَجُل يسأله عن مسألة في الدين، يُنازعه فيها ويخاصمه، تُرى له أن يناظره حتى تثبت عليه الحُجة، ويُرَّد عليه؟ قيل له: هذا الذي نُهينا عنه، وهو الذي حَذَّرناه مَن تقدم مِن أئمة المسلمين.

فإن قال: فماذا نصنع؟ قيل له: إن كان الذي يسألك مسألة، مسألة مسترشد إلى طريق الحق، لا مناظرة، فأرشده بألطف ما يكون مِنَ البيان بالعلم مِنَ الكتاب والسُّنة وقول الصحابة، وقول أئمة المسليمن رضي الله عنهم، وإن كان يريد مناظرتك ومجادلتك، فهذا الذي كره لك العلماء،

فلا تناظره واحذره على دينك، كما قال مَن تقدم مِن أئمة المسلمين إن كنت لهم مُتبعًا.

فإن قال: فندعهم يتكلمون بالباطل، ونسكت عنهم؟ قيل له: سكوتك عنهم، وهجرتك لما تكلموا به، أَشَدُّ عليهم مِن مناظرتك لهم، كذا قال مَن تقدم مِنَ السلف الصالح مِن علماء المسلمين.

**أيوب السختياني** دەڵێ: ئەهلی بیدەع بە هیچ جۆرێک وەڵامم نەداونەتەوە قورسبێ لەسەریان هێندەی ئەوەی بێدەنگ بووم لەسەریان.

حدثنا أبو بكر ابن عبدالحميد، قال: حدثنا زهير بن محمد، قال: أخبرنا منصور بن سفيان، قال: حدثنا حماد بن زيد، عن أيوب أنه قال: لستُ بِرَّادٍ عليهم أَشَدَّ من السكوت.

كتاب الشريعة للآجري | ١٣٢ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٠٦

**مالك بن أنس** دەڵێ: دەردی گوازراوە: دین گۆڕینە هەرجارە لەسەر عەقیدەیەک.

حدثنا الصفَّار، قال: حدثنا الرمادي، قال: حدثنا يحيى بن بكير، قال: قال مالك: الداءُ العُضالُ: التَّنَقُّلُ في الدين.

الابانة الكبرى لابن بطة ا ٦٠٢

**عمر بن عبدالعزيز** دەڵێ: هەرکەسێک دینەکەی بکاتە ئامانجێک بۆ مشتومڕ و ناکۆکی، ئەوە زۆر دەگوازێتەوە و زوو عەقیدەی دەگوڕێ.

أحبرنا يحيى بن حسان، قال: حدثنا عبدالله بن إدريس، عن إسماعيل بن أبي حكيم، قال: سمعت عمر بن عبدالعزيز، يقول: مَن جعل دينه غَرضًا للخصومات أكثر التَّنَقُّلَ.

سنن الدارمى ا ٣١٣ كتاب القدر للفريابي ا ٣٨٥ كتاب السنة للخلال ا ١٩٢٣ كتاب الشريعة للآجري ا ١١٦ الابانة الكبرى لابن بطة ا ٦٠٦ جامع بيان العلم لابن عبدالبر ا ١٧٧٠ الفقيه والمتفقه للخطيب ا ٦١٢ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢١٦

**معن بن عيسى** دەڵێ: ڕۆژێک مالک بن أنس لە مزگەوت دەرچوو، پاڵی دابوو بە دەستی منەوە، پیاوێک شوێنی کەوت پێی دەوترا: باوکی الجويرية، موتەهەم بوو بە إرجاء، وتی: ئەی باوکی عبدالله، گوێم لێبگرە قسەت بۆ بکەم و ڕەئی خۆمت پێدەڵێم و مونازەڕەت لەگەڵ بکەم. مالک وتی: ئەگەر منت بەزاند؟ وتی: ئەگەر بەزاندمی ئەوە شوێنم دەکەوی.

مالک وتی: ئەی ئەگەر پیاوێکی تر هات قسەی لەگەڵ کردین و بەزاندینی؟ وتی: هەردووکمان شوێنی دەکەوین. مالک وتی: ئەی بەندەی الله، الله ﷻ محمد ـی ﷺ بە یەک دین نارد، دەتبینم لە دینێکەوە دەگوازیتەوە بۆ دینێکی تر؟ عمر بن عبدالعزیز دەڵێ: هەرکەسێک دینەکەی بکاتە ئامانجێک بۆ مشتومڕ و ناکۆکی، ئەوە زۆر دەگوازێتەوە و زوو عەقیدەی دەگۆڕێ.

حدثنا الفريابي أيضًا، قال: حدثني إبراهيم بن المنذر الحِزامي، قال: حدثنا مَعنُ بن عيسى، قال: انصرف مالك بن أُنس يومًا مِنَ المسجد، وهو متكئ على يدي، قال: فلحقه رجلُ يقال له: أبو الجويرية، كان يُتَّهم بالإرجاء، فقال: يا أبا عبدالله، اسمع مني شيئًا أُكلمُك به، وأُحاجُّك، وأُخبرُك برأي. قال: فإن غَلَبتَني؟ قال: إن غَلَبتُك اتبعني. قال: فإن جاء رجل آخر فَكَلَّمَنا فَغَلَبَنا؟ قال: نتبِعُه. فقال مالك: يا عبدالله، بعث الله محمدًا ﷺ بدينٍ واحدٍ، وأراك تنتقل مِن دينٍ إلى دين؟ قال عمر بن عبدالعزيز: مَن جعل دينه غَرضًا للخصومات أكثر التَّنَقُّلَ.

كتاب الشريعة للآجري | ١١٧ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٠٩

**أبو علي حنبل بن إسحاق** کە کوڕە مامی ئیمام أحمد ـە دەڵێ: پیاوێک نامەیەکی نوسی بۆ أبي عبدالله أحمد بن حنبل داوای ئیزنی لێکرد هەتا کتێبێک بنوسێ ڕەدی مەقالەکانی ئەهلی بیدەعی تێدا بداتەوە، وە لەگەڵ ئەهلی کەلام ڕووبەڕوو ببێتەوە مونازەڕەیان لەگەڵ بکات و بیانوویان ببڕێ. أبو عبدالله بۆی نوسی: بسم الله الرحمن الرحيم، الله عاقیبەتت چاک بکات و بتپارێزێ و دوورت بخاتەوە لە هەموو خراپە و ناڕەحەتییەک، ئەوەی ئێمە بیستوومانە و ئەهلی عیلمان بینیوە پێیان ناخۆش بووە و بە باشیان نەزانیوە لەگەڵ گومڕاکاندا دانیشتن بکرێ، بەڵکو ئەصڵی مەسەلەکە تەسلیم بوونە بەوەی لە کتێبی الله ﷻ، سوننەتی ڕەسول الله ﷺ هاتووە، نەوەک دانیشتن لەگەڵ ئەهلی بیدەع و ئەهلی زەیغ و گومڕایی کە لە ڕێگەی حەق لایانداوە بۆ ئەوەی ڕەدیان بدرێتەوە، چونکە ئەوان تەلبیست لێدەکەن باتڵت وەک حەق نیشان دەدەن، هەرچەندە هەوڵ بدەی لەگەڵیان پاشگەز نابنەوە لەو گومڕاییەی تیایدان، بزانە سەلامەتی إن شاء الله لە تەرک کردنی دانیشتنە لەگەڵیان، وە ڕووبەڕوو نەبیتەوە لەگەڵیان دەربارەی ئەو گومڕایی و بیدعەیەی تێی کەوتوون.

با هەرکەسێک ئاگاداری خۆی بێ، لەسەر عەمەلی صاڵح بەردەوام بێت و پێشی بخات کە سبەی دەمرێ سوودی پێبگەیێنێ، با خەریک نەبێ شتێکی تازە دابهێنێ، کاتێک لێوەی دەرچێ و ببیسترێ پێویست بە دەلیل و حوجە بکات، ئەوکات پاڵنەر بێ بۆ نەفسی خۆی هەتا فێڵ ئەنجام بدات، وە بە دوای دەلیلەوە بێ بۆ ئەوەی وتوویەتی گەر حەق بێ یاخود باتڵ، بەو جۆرە ئەو بیدعەیەی دایهێناوە بیڕازێنێتەوە. وە قورستریش لەمە ئەوەیە لە کتێبێک جێگیری کردبێ، وە خەڵکی لێوەی وەری بگرن، بەمەش دەیەوێ ئەو حەق و باتڵە بڕازێنێتەوە، لەکاتێکدا حەق لە غەیری ئەوەدایە.

داوا لە الله دەکەم ئێمە و ئێوەش مۆفق بکات. والسلام عليک.

حدثنا أبو صالح محمد بن أحمد، قال: حدثنا أبو الحسن علي بن عيسى بن الوليد العكبري، قال: حدثني أبو علي حنبل بن إسحاق بن حنبل، قال: كتب رجل إلى أبي عبدالله رحمه الله كتابًا يستأذنه فيه أن يضع كتابًا يشرح فيه الرَّد على أهل البدع، وأن يُحْضَر مع أهل الكلام فيناظرهم، ويحتج عليهم. فكتب إليه أبو عبدالله: بسم الله الرحمن الرحيم، أحسن الله عاقبتک، ودفع عنک كُلَّ مكروه ومحذور، الذي كنا نسمعُ، وأدركنا

عليه من أدركنا من أهل العلم، أنهم كانوا يكرهون الكلام، والجلوس مع أهل الزيغ، وإنما الأمر في التسليم، والإنتهاء إلى ما كان في كتاب الله، أو سنة رسول الله ﷺ، لا في الجلوس مع أهل البدع والزيغ لِتَرُدَّ عليهم ، فإنهم يُلبِّسون عليك وهم لا يرجعون، فالسلامة -إن شاء الله- في ترك مجالستهم، والخوض معهم في بدعتهم وضلالتهم.

فليتق الله امرؤ، وليَصِر إلى ما يعودُ عليه نفعه غدًا من عمل صالح يُقَدِّمُهُ لنفسِهِ، ولا يكن ممن يُحدثُ أمرًا، فإذا هو خرج منه أراد الحُجَّة، فيحملُ نفسه على المحَالِ فيه، وطلبِ الحُجَّة لما خرجَ منه بحقٍّ أو بباطلٍ، لِيُزَيِّنَ به بدعته وما أحدث.

وأَشَدُّ من ذالک أن يکون قد وضعه في كتابٍ قد حُمِلَ عنه، فهو يُريدُ أن يُزَيِّن ذالک الحق والباطلِ، وإن وضح له الحقُّ في غيره.

ونسأل الله التوفيق لنا ولک. والسَّلام عليک.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٥٠٨

**إِبن بطة** دەڵێ: فالله الله کۆمەڵی موسڵمانان، هیچ کەسێک لە ئێوە بە هۆی ئەوەی گومانی باشی بە نەفسی خۆی هەیە، وە سەلامەتە لە

دروستی مەزهەب و عەقیدەکەی ئەمە نەکاتە هۆکار و پاڵنەرێک هەتا بچێ لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوو دابنیشێت و دینەکەی بخاتە مەترسییەوە، بڵێ: دەچم مونازەڕەیان لەگەڵ دەکەم هەتا مەزهەبە باتڵەکەیان پووچەڵ دەکەمەوە، چونکە فیتنەی ئەمانە لە فیتنەی دەجال مەترسیدارترە، کەلامەکەیان لە نەخۆشی گەڕی زووتر دەچەسپێت و دەچێتە دڵەوە، وە لە ئاگر زیاتر دڵ دەسوتێنێ.

کۆمەڵێکم لە خەڵکی دەبینی سەرەتا لەعنەتیان لێدەکردن و قسەیان پێدەوتن، لەگەڵیان دادەنیشتن و ڕەدیان دەدانەوە و عەقیدەکانیان پووچەڵ دەکردنەوە، هێندە لەگەڵیان دانیشتن هەتا فێڵە شاراوەکانیان کاری تێکردن، وە کوفرە نهێنییەکانیان ڕژاندە سەریان.

قال إبن بطة: فالله الله يا معشر المسلمين، لا يحملن أحدًا منكم حسن ظنه بنفسه، وما عهده مِن معرفته بصحة مذهبه على المُخاطرة بدينه في مُجالسة بعض أهل الأهواء، فيقول: أُداخله لأناظره، أو لأستخرج منه مذهبه، فإنهم أشدُّ فتنة من الدَّجَّال، وكلامهم ألصَق مِنَ الجرب، وأَحرقُ للقلوب مِنَ اللَّهَبِ.

ولقد رأيتُ جماعة من الناس كانوا يلعنونهم، ويسبونهم، فجالسوهم على سبيل الإنكار والرد عليهم، فما زالت بهم المباسطة وخَفِيُّ المَكْرِ، ودَقِيقُ الكُفرِ حتى صَبَوا إليهم.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٥٠٢

**أبو صالح** دەڵێ: عبدالعزيز بن الماجشون خوێندیەوە بە سەرمدا و نوسیم وتی: ئاگاداری خۆتان بن لە ناكۆكی و مشتومڕ، چونكە نزیكتان دەكاتەوە لە هەموو بە هیلاک چوونێک، وە ناتان گەیێنێ بە ثقەیەک، مشتومڕ مودەیەكی دیاری كراوی نییە هەتا بگاتە كۆتاییەكەی، بەڵكو دەچێتە ناو هەموو شتێكەوە، كەواتە ڕێگەی خۆلادان لێی هەڵبژێرن، چونكە ئەوە ڕێگەی ڕێنمونی و خۆپاراستنە، وە مشتومڕ و قووڵ بوونەوە لادانە لە حەق و ڕێگایەكی غەڵەتە، پێت وا نەبێ قووڵ بوونەوە لە دین ثەبات و شارەزایی بێ، چونكە ئەهلی ثەبات و شارەزا لە عیلمدا ئەوانەن كە لەوەدا دەوەستن كە عیلمیان پێی هەیە و تێناپەڕن لێی.

ئاگادار بن لێیان مشتومڕتان لەگەڵ دەكەن بە تەئویلی قورئان، وە ئەو حدیثانەی ڕەسول الله ﷺ كە پێتان وایە لە ظاهردا پێچەوانە دەردەكەون، مشتومڕیان لەگەڵ مەكەن با لە ڕێی ڕاست پێتان نەخلیسكێ هەروەک

چۆن ئەوان خلیسکان، وە گومڕا ببن وەک چۆن ئەوان گومڕا بوون، بە دڵنیاییەوە ئەوەی سەلەف لەسەری بوون کافییە بۆتان و بێ پێویستن لەوەی غیری ئەوان، چونکە ئەوەیان بۆ هێناوی کە ڕەئی خۆت لە بەرامبەریدا ناوەستێ و یەکسان نابێ پێی، تەکلیف و زۆرکردن و ڕۆچوون لە دین مەکە لەبەر کەسانێک کە تەعن دەدەن لە دین، گوێی خۆتیان بۆ شل مەکە، ئەوانە دەیانەوێ ناڕەحەتت بکەن یاخود تووشی شوبهەت بکەن، لەگەڵیان دامەنیشە، الله ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَىٰ مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴾.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا أبو صالح كاتب الليث، قال: أَمْلى عليَّ عبدالعزيز بن الماجشون، قال: احذروا الجَدل، فإنه يقربُكم إلى كُلِّ موبقة، ولا يسلمكم إلى ثقةٍ، ليس له أَجلٌّ يُنتهى إليه، وهو يدخل في كُلِّ شيءٍ، فاتخذوا الكفَّ عنه طريقًا، فإنه القصد والهدى، وإنَّ الجَدَل والتعمق هو جَور السبيل، وصراط الخطأ، فلا تحسبنَّ التعمُق في الدين رَسْخًا، فإنَّ الراسخين في العلم هم الذين وقفوا حيث تناهى علمهم.

فاحذروهم أن يُجادلوک بتأويل القرآن، واختلاف الأحاديث عن رسول الله ﷺ، وتُجادلهم فتزلَّ كما زلُّوا، وتَضلَّ كما ضلُّوا، فقد كفتک السِّرة - يعني: سيرة السلف- مؤونتها، وأقامت لک منها ما لم تكن لتعدله برأيک، فلا تتكلِّفنَّ صفة الدِّين لمن يطعن في الدِّين، ولا تمكنهم مِن نفسک، ولا تعرضهم لذالک، فإنما يريدون أن يعنتوک أو يأتوک بشُبهةٍ، ولا تقعد معهم. قال الله ﷻ: ﴿ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَىٰ مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴾.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٨٥

**إبن بطة** دەڵێ: ئەگەر هاتوو کەسێک بپرسێ: باشە ئاگادارت کردینەوە لە موجادەلە و مشتومڕ و ناکۆکی و مونازەڕە، وە زانیمان ئەمە حەقە، وە ڕێگەی زانایانە، وە ڕێگەی صەحابەیە رضي الله عنهم، وە ڕێگەی ئەهلی عەقڵە لە ئیمانداران و زانا بەصیر و شارەزاکان، ئەی ئەگەر پیاوێک هات پرسیاری شتێکی لێکردم لەم هەوا و ئارەزووانەی دەرکەوتوون، وە ئەم مەزهەبە پیسانەی بڵاوبوونەتەوە، پرسیارم لێبکات دەربارەی هەندێک بابەتیان بە دوای وەڵامەوەیە، وە من کەسێکم الله ﷻ شارەزای کردووم عیلمێکم هەیە پێی، وە تێڕوانین و بینینێکی چاکم هەیە لە کەشف کردنی، ئایا وازی لێبهێنم قسە بکات و ئەوەی دەیەوێ بیڵێ وەڵامی نەدەمەوە،

واز لە خۆی و هەوا و ئارەزووەکەی بهێنم، ڕەدی قەولە پیسەکانی نەدەمەوە؟

لە وەڵامدا من پێی دەڵێم: بزانە برام ڕەحمەتی الله ـت لێبێ ئەوەی کە گیرۆدە دەبێ لەم بوارەدا یەکێکە لەم سێ کەسە:

١- کەسی یەکەم پیاوێکە دەزانی لەسەر ڕێگەیەکی چاکە، وە مەزهەبێکی جوانی هەیە، سەلامەتی لە دینی و ڕێگای ئیستقامەی خۆش دەوێ، بەڵام گوێی گرتووە بۆ وتەی ئەو کەسانەی کە شەیتانەکان لە دڵەکانیاندا نیشتەجێ بوون، بە چەندین جۆری کوفر دەدوێ لەسەر زمانی ئەوانەوە، وە ئەم کەسە وەجهی دەرچوون لەو بابەتەی تێی کەوتووە نازانێ، بۆیە پرسیار کردنەکەی پرسیاری فێربوونە دەیەوێ دەرچەیەک بدۆزێتەوە لەوەی تووشی بووە، وە ببێتە شیفا بۆ ئەو دەرد و ناڕەحەتیەی تووشی بووە و ئازاری دەدا، تینووە بۆ زانستەکەت پێویستی ئەو پێت وەک پێویستی ئەو کەسە تینووەیە بۆ ئاوی سازگار، وە تۆ هەست دەکەی ئەم کەسە گوێڕایەڵتە، وە ئەمینی لەوەی کە موخالەفەت بکات، ئەمە ئەو کەسەیە کە واجبە لەسەرت ئامۆژگاری بکەیت و هەوڵی لەگەڵدا بدەی هەتا بیخەیتەوە سەر ڕێگای ڕاست، وە پێوستە ئەو شوبهەیەی چووەتە

دڵیەوە بۆی کەشف بکەی، وە ئەو گومانەی لای دروست بووە نەیهێڵی هەتا ڕزگاری بکەی لە تۆڕی مولحیدەکان، وە بیگوازیتەوە لە گوریس و فێڵی شەیتانەکان. با ئەوەی ئامۆژگاری و ڕێنمونی پێدەکەی و لەسەری دەوەستی پێکهاتبێ: لە قورئان و سوننە و ئاثاری صەحیح لە زانایانی ئوممەت لە صەحابە رضي الله عنهم و تابعين، وە هەموو ئەمەش بە دانایی و شێوازێکی جوان و ئامۆژگارییانە بێ.

وە ئاگاداربە تەکلیفی زیادە لە خۆت مەکە ڕۆمەچۆ لەوەی کە نایزانی، وە وریای خۆتبە لە فێڵ و مەکری ڕەئی، وە نوقم بوون لە وردی کەلام، چونکە ئەم کردەوەیەت بیدعەیە، تەنانەت ئەگەر مەبەستیشت پێی سوننە بێ، چونکە ویستی تۆ بۆ حەق دوور لە ڕێگەی حەق باتڵە، وە وتەی تۆ دەربارەی سوننە کاتێک دوور لە سوننە دەدوێی ئەوە بیدعەیە.

بۆیە بە دوای شیفاوە مەبە بۆ هاوڕێکەت بە ژەهری نەفست، وە داوای چاک بوونی مەکە بە فەسادی خۆت، چونکە ئەو کەسەی خیانەت و غەش لە نەفسی دەکات ئامۆژگاری خەڵکی پێناکرێ، وە ئەو کەسەی خێر لە نەفسیدا نییە خێری نابێ بۆ خەڵکانی تر، هەرکەسێک بیەوێ

بگاتە الله ﷻ ئەوە تەوفیقی دەدات، وە هەرکەسێکیش تەقوای الله ـی هەبێ ئەوە الله ﷻ یارمەتیدەری دەبێ.

**المروذي** دەڵێ: ڕۆژێک أبا بکر بن مسلم الزاهد باسی موخالفین و ئەهلی بیدەعی دەکرد ، وتی: کەمێک لە تەقوا سوپایەک دەبەزێنێ.

**ابن عون** دەڵێ: بیستم محمد بن سیرین ڕێگری دەکرد لە جیدال ئیللا مەگەر بۆ کەسێک ئەگەر قسەی لەگەڵ بکەی ئومێدت پێی هەبێ بگەڕێتەوە.

**محمد بن النضر الحارثي** دەڵێ: بە الأوزاعي ـم وت: ئەمر بکەم بە چاکە؟ وتی: جا کێ لێتی وەردەگرێ؟!

ڕەحمەتی الله لە الأوزاعي بێ ڕاستی وتووە، بەم شێوازەش لە علي بن أبي طالب رضي الله عنه وارد بووە دەڵێ: ئەمر کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە لە کەسێک مەکە کە گوێڕایەڵیت ناکات.

جا ئەگەر ئەو کەسەی پرسیارت لێدەکات ئەم صیفاتانەی تێدایە، وە وەڵامدانەوەکەی تۆش بەم جۆرەیە کە شەرحم کرد بۆت، ئەوە وەڵامی بدەوە، وە کەم تەرخەم مەبە بەرامبەری، ئەمە ڕێگەی زانایانە، وە ڕێگەی

ئەهلی عەقڵە لە ئیمانداران، وە مەزهەبی زانایانی پێشینە ئەوانەی الله ﷻ کردنیە ئیمام و عەللامە لەم دینەدا، ئەمە حاڵی یەکێک بوو لەو سێ کەسە.

٢- وە کەسی دووەم پیاوێکە لە مەجلسێکدایە تۆش لەوێ ئامادەی، وە ئەمینی لە نەفسی خۆت لەوەی تووشی فیتنە ببی، وە لەوێدا هاوەڵانی خۆت زۆرن سەرخەر و یارمەتیدەرتن، ئەو پیاوە دەست دەکات بە قسە کردن لە بابەتێک کە فیتنە و بەڵایە بۆ سەر دڵی ئەوانەی دەیبیستن بۆ ئەوەی گومان بخاتە دڵیانەوە، چونکە ئەو خۆی لەو کەسانەیە زەیغ و گومڕایی تێدایە شوێن موتەشابیهـ دەکەوێ بە مەبەستی فیتنە و بیدعە، وە تۆش هاوەڵ و براکانت و ئەهلی مەزهەبەکەتت لەگەڵە وە قسەکانی ئەو دەبیستن، بەڵام بەڵگەیان لا نییە دەربارەی ڕەد دانەوەی قسەکانی، وە عیلمیان پێ نییە دەربارەی خراپی و قەبیحی قسەکانی، جا ئەگەر تۆ بێدەنگ بی ئەوە ئەمین نابی لێی فیتنە دروست دەکات، وە دڵی ئەوانەی گوێیان لە قسەکانی بووە خراپ دەکات، وە گومانیش لای ئەوانە دروست دەکات کە تێڕوانین و شارەزاییەکیان هەیە.

ئەم کەسەش دەبێ ڕەدی بیدعە و قەولە خراپەکەی بدرێتەوە، وە دەبێ ئەوەی الله ﷻ پێتی بەخشیوە لە زانست و دانایی ببەخشیت و بڵاوی

بکەیتەوە، وە نابێ مەبەستت لە ڕەد دانەوەی مشتومڕ و مونازەڕە بێ، بەڵکو دەبێ مەبەستت لە قسە کردن و ڕەد دانەوەی ڕزگارکردنی براکانت بێ لە تۆڕ و فێڵ و فیتنەی ئەو کەسە، چونکە چەپڵەکانی ئەهلی ئیلحاد تۆڕی شەیتانی دادەنێن بۆ ئەوەی باوەڕداران ڕاو بکەن، بۆیە بە دەمەوە چوونی قسەکانت لەگەڵ دانایی و بەخشینەوەی زانستەکەت و ڕووخۆشی و ڕەوانی مەنتیقت بۆ براکانت بێ لەگەڵ ئەوانەی ئامادەن نەک بۆ ئەو کەسەی ڕەدی دەدەیتەوە، بۆ ئەوەی ئەوانی لێداببڕی کارێک بکە هەتا گوێت بۆ تۆ شل بکەن نەک بۆ قسەکانی ئەو، هەتا ئەگەر توانات هەبوو قسەکانی بپچڕێنی بە جۆرێک لە زانست بۆ ئەوەی ڕووی خەڵکی لەو دوور بخەیتەوە، ئەوە بیکە.

**مثنى بن جامع** دەڵێ: بیستم پرسیارکرا لە بشر بن الحارث دەربارەی پیاوێک لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزووە لەسەر جەنازەیە یاخود سەرقەبران قسە دەکەن، وای دەبینی وەڵامیان بدەینەوە؟ وتی: ئەگەر ئەوانەی لەگەڵتن هەیانە نەزانێ، ئەوە ڕەدی بدەنەوە هەتا ئەوانەی کە شارەزا نین پێیان وانەبێ کە قسەکانی ئەوان دروستن، وە ئەگەر هاتوو خۆتان و ئەوان بوون، ئەوە قسەیان لەگەڵ مەکەن و وەڵامیان مەدەنەوە.

ئەوە دوو کەسیان بوون حاڵیانم بۆت ڕوون کردەوە، بە کورتی تەوجیهی کەلامم دەربارەیان خستەڕوو.

٣- وە سێهەمیان کەسێکی خراپ و شوومە دڵی تووشی لادان بووە لە حەق، وە پێی خلیسکاوە لە ڕێگای هیدایەت و ئیستقامە، وە بینایی داپۆشراوە و کوێر بووە، وە توانیویەتی و هەوڵیداوە بۆ سەرخستنی بیدعە، هەموو هەوڵ و کۆششی بۆ ئەوەیە گومان لە یەقین دروست بکات، وە دینی ڕاستت لێ تێک بدات و خراپ بکات.

هەموو ئەوەی لەم بابەدا ڕیوایەتمان کردووە و گێڕاومانەتەوە لەبەر ئەم کەسی سێهەمەیە، تۆ هیچ شتێک ناهێنی لە بابی مشتومڕ لەگەڵی و ئازاری فێڵەکانی هێندەی بێدەنگ بوون لە وەڵام دانەوەی چاک بێ، وە پشت کردن لێی، چونکە مەبەستی ئەو لە مونازەڕە کردن لەگەڵت دوو شتە:

أ- تووشی فیتنەت بکات شوێنی بکەوی و بە هیلاک بچی.

ب- بێ هیوا دەبێ لێت لەوەی شوێنی بکەوی، تووڕەیی و ڕق و کینەی بەوە خاڵی و هێور دەکاتەوە شتانێک لە دین دەدات بە گوێتدا کە پێت ناخۆشە.

جا تۆش بچووکی بکەوە بە دوور خستنەوە و دەرکردنی و هیچی لێوەرمەگرە، وە زەلیلی بکە بە هەجر کردن و وەڵام نەدانەوەی.

مەگەر هەواڵم پێت نەداوە بە وتەی حسن البصري کاتێک کەسێک پێی دەڵێ: ئەی باوکی سعید، وەرە با مشتومڕت لەگەڵ بکەم لە دیندا. ئەویش پێی دەڵێ: ئەمما من ئەوە دینی خۆمم دۆزیوەتەوە، ئەگەر تۆ دینەکەتت ون کردووە، ئەوە بڕۆ بیدۆزەرەوە.

وە هەواڵم پێداوی بە وتەی مالک کاتێک کەسێک لە ئەهلی هەوا و ئارەزوو دێت بۆ لای داوای مشتومڕی لێدەکات، ئەویش پێی دەڵێ: من ئەوە بەرچاو ڕوونم لە پەروەردگارم، ئەمما تۆ ئەوە گومانت هەیە کەواتە بچۆ بۆ لای کەسێک وەک خۆت گومانی هەبێ مشتومڕی لەگەڵ بکە.

ئایا لە وەڵام دانەوەی کەسی موخالف لە هەموو بەڵگەکان دەتوانێ بەڵگەیەک بهێنێ داخکەر بێ بۆ چاوی، وە تووڕەکەر بێ بۆ دڵی هێندەی ئەو بەڵگە و وەڵامە؟

وتەی مصعب بن سعد ـت نەبیستووە کە دەڵێ: لەگەڵ کەسی خاوەن فیتنە دامەنیشە، چونکە لەم دوو حاڵەتە ئیللا توشی دانەیەکیانت دەکات:

توشی فیتنەت دەکات و شوێنی دەکەوی، یاخود ئازارت دەدات پێش ئەوەی لێی جیابیتەوە.

وە وتەی أیوب السختیاني کاتێک پیاوێک پێی دەڵێ: یەک قسەت لەگەڵ دەکەم، أیوب پشت هەڵدەکات، بە پەنجەی ئیشارەتی بۆ دەکات، دەڵێ: نیو کەلیمەشم بۆ مەڵێ.

وە وتەی عبدالرزاق کاتێک کە بە ابن أبي یحیی دەڵێ: دڵ لاوازە، وە دینیش ئەوە نییە هەرکەس زاڵ بوو ئەوە لەسەر حەق بێ.

الأعمش دەڵێ: بێدەنگ بوون و وەڵام نەدانەوە وەڵامە.

شبیب بن شیبة دەڵێ: هەرکەسێک ئارام بگرێ لەسەر وشەیەک، ئەوە یەکلایی کردووەتەوە و بنەبڕی کردووە و سەرکەوتووە، وە هەرکەسێک وەڵامی بداتەوە ئەوە بووەتە هۆکارێک بۆ زیاد بوونی .

وە تۆ ئەگەر ڕێگای ئیستقامە و سەلامەتیت دەوێ، ئەوەی باسمان کرد ڕێگای زانایان و ئەهلی عەقڵە، وە هێندەت بەسە کە لەوانەوە پێت گەیشتووە لە زانست و عەمەل و ڕێنمونییان، وە ئەگەریش لەو کەسانەی کە دڵی گومڕا بووە، وە پێیەکانی خلیسکاون، وە خۆت داوەتە پاڵ

کۆمەڵێکی گومڕا و حیزبی شەیتان، ئەوە ئەو شتەی لای ئەهلی عەقڵ بێزراو بووە و لێی هەڵهاتوون تۆ ئارام دەبی پێی، وە ڕوغبەتت لێی هەیە لەکاتێکدا ئەوان خۆیان لێی لاداوە و بێ پێویست بوون لێی، ئەهلی مونازەڕە و موجادەلە بوونەتە هاوڕێ و پشتیوانت، وە ئەندامەکانی جەستەت خۆشحاڵن پێیان کاتێک دەیان بینی و دڵت دەکرێتەوە بە قسە کردن لەگەڵیان، وە ئەوەت کردووەتە هۆکارێک بۆ دانیشتن لەگەڵیان گوایە مونازەڕەیان لەگەڵ دەکەی، هەتا بیانوویان ببڕی و ڕەدی باتڵەکەیان بدەیتەوە، ئەگەر ئەم ڕازاندنەوەی باتڵەت لە ئەهلی غەفڵەت لە ئینسانەکان شاراوە بێ، ئەوە شاراوە نابێ لەو زاتەی کە عەلیمە بە سەیرکردنی لا چاو، وە نهێنی شاراوەی دڵەکان دەزانێ و بەلایەوە ئاشکرایە.

فإن قال قائل: قد حذرتنا الخصومة، والمِراء، والجِدال، والمُناظرة، وقد علمنا أنَّ هذا هو الحق، وأنَّ هذه سبيل العلماء، وطريق الصحابة رضي الله عنهم والعقلاء مِنَ المؤمنين والعلماء المُستبصرين، فإن جاءني رَجُلُ يسألني عن شيءٍ مِن هذه الأهواء التي قد ظهرت، والمذاهب القبيحة التي قد انتشرت، ويُخاطبني منها بأشياء يلتمسُ مني الجواب عليها، وأنا ممن

قد وَهَبَ الله الكريم لي عِلمًا بها، وبَصَرًا نافذًا في كشفها، أفأتركه يتكلم بما يُريد ولا أُجيبه، وأُخلِّيه وهواه وبدعته، ولا أردُّ عليه قبيح مَقالته؟

فإني أقول له: اعلم -يا أخي رحمك الله- أنَّ الذي تُبلى به مِن أهل هذا الشأن لن يخلو أن يكون واحدًا مِن ثلاثة:

١- إما رَجُلًا قد عرفت حسن طريقته، وجميل مذهبه، ومحبته للسلامة، وقصده طريق الاستقامة، وإنما قد طرق سمعه مِن كلام هؤلاء الذين سكنت الشياطين قلوبهم، فهي تنطق بأنواع الكُفر على ألسنتهم، وليس يعرف وجه المخرج مما قد بلي به، فسؤاله سؤال مُسترشد متثبت يَلتمس المخرج مما بلي به، والشِّفاء مما أوذي، ظمآنٌ إلى عِلمك حاجته إليك حاجة الصادي إلى الماء الزُّلال، وأنت فقد استشعرت طاعته، وآمنت مُخالفته، فهذا الذي قد افترِضَ عليك توفيقه، وإرشاده، وكشف الشُّبهة عن قلبه، وإزالة الريب الذي خامر سرَّه حتى تخلِّصه مِن شبكةِ المُلحدين، وتنقله مِن حبائل كيد الشياطين. وليكن ما ترشدُه به، وتوقفه عليه مِن: الكتاب، والسُّنة، والآثار الصحيحة عن علماء الأمة مِنَ الصحابة رضي الله عنهم والتابعين، وكُلُّ ذالك بالحكمة والموعظة الحسنة.

وإياك والتكَلُّف لما لا تعرفه، وتمحّل الرأي، والغوص على دقيق الكلام، فإنَّ ذالك مِن فعلك بدعة، وإن كنت تريد به السُّنة، فإن إرادتك للحق مِن غير طريق الحق باطل، وكلامك على السُّنة مِن غير السُّنة بدعة.

فلا تلتمس لصاحبك الشفاء بسقم نفسك، ولا تطلب صلاحه بفسادك، فإنه لا ينصح الناس مَن غَشَّ نفسه، ومَن لا خير فيه لنفسه، لا خير فيه لغيره. فمن أراد الله وفقه وسدده، ومَن اتقى الله، أعانه الله.

سمعت جعفر القافُلائي، يقول: سمعت المروذي، يقول: سمعت أبا بكر ابن مسلم الزاهد، يقول: وقد ذكر يومًا المخالفين، وأهل البدع، فقال: قليل مِنَ التقوى يهزم العساكر والجيوش.

حدثنا أبو القاسم حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا أبو الربيع الزهراني، قال: حدثنا حماد بن زيد، قال: حدثنا ابن عَون، قال: سمعت محمد ابن سيرين ينهى عن الجِدال إلا رَجُلًا إن كلمته طَمِعتَ في رجوعه.

حدثنا أبو بكر أحمد بن محمد بن السَّري الكوفي، قال: حدثنا عبدالله بن غنام، قال: حدثنا أبو عمران موسى بن عيسى الخياط، قال: حدثنا إسماعيل بن أبي الحارث، قال: حدثني بعض أصحابنا، عن محمد بن

النضر الحارثي، قال: قلت للأوزاعي: آمر بالمعروف؟ قال: مَن يقبل منك؟!

صَدَقَ الأوزاعي رحمه الله، فهكذا قال علي بن أبي طالب رضي الله عنه: لا إمرة لَمَن لا يُطاع.

فإذا كانَ السائل لك هذه أوصافه، وجوابك له على النحو الذي قد شرحته، فشأنك به، ولا تألُ فيه جهدًا، فهذه سبيل العلماء، وطريقة المؤمنين والعقلاء، ومذاهب الأئمة العلماء الماضين الذين جعلهم الله أعلامًا في هذا الدين، فهذا أحد الثلاثة.

٢- ورَجُلُ آخر يحضر في مجلس أنت فيه حاضر، تأمن فيه على نفسك، ويكثر ناصروك ومعينوك، فيتكلم بكلامٍ فيه فتنةٌ وبَليَّة على قلوب مستمعيه ليوقع الشَّكَّ في القلوب، لأنه هو ممن في قلبه زيغٌ يتبع الُمتشابه ابتغاء الفتنة والبدعة، وقد حضر معك إخوانك وأهل مذهبك مَن يسمع كلامه، إلا أنه لا حُجَّة عندهم على مقالته، ولا عِلمَ لهم بقبيح ما يأتي به، فإن سكَتَّ عنه لم تأمن فتنته، وأن يفسد بها قلوب الُمستمعين، وإدخال الشَّكَّ على الُمستبصرين.

فهذا أيضًا ممن تُرَّد عليه بدعته، وخبيث مَقالته، وتنشر ما عَلَّمك الله مِنَ العلم والحكمة، ولا يكن قَصدُكَ في الكلام خصومته ولا مُناظرته، وليكن قَصدُك بكلامك خلاص إخوانك مِن شبكته، فإنَّ خُبَثاء الملاحدة إنما يبسطون شباك الشياطين ليصيدوا بها المؤمنون، فليكن إقبالك بكلامك، ونشر علمك وحكمتك، وبشر وجهك، وفصيح منطقك على إخوانك، ومَن قد حضر معك لا عليه، حتى تقطع أُولئك عنه، وتحول بينهم وبين استماع كلامه، بل إن قدرت أن تقطع عليه كلامه بنوع مِنَ العلم تحوِّلُ به وجوه الناس عنه، فافعل.

حدثني أبو صالح، قال: حدثنا محمد بن داود أبو جعفر البَصروي، قال: حدثنا مثنى بن جامع، قال: سمعت بشر بن الحارث، سُئِل عن الرَّجُل يكون مع هؤلاء أهل الأهواء في موضع جنازةٍ أو مقبرةٍ فيتكلمون ويُعرضون، فترى لنا أن نُجيبهم؟ فقال: إن كان معك مَن لا يعلم، فردوا عليه لئلا يرى أولئك أن القول كما يقولون، وإن كنتم أنتم وهم، فلا تكلموهم، ولا تجيبوهم.

فهذان رَجُلان قد عرَّفتُك حالهما، ولخَّصتُ وجه الكلام لهما.

٣- وثالث مشئووم قد زاغ قلبه، وزلت عن سبيل الرَّشاد قَدمه، فغشيت بصيرته، واستحكمت للبدعة نصرته، فجهده أن يُشكِّكَ في اليقين، ويُفسد عليک صحيح الدين.

فجميع الذي رويناه وكُل ما حكيناه في هذا الباب لأجله وبسببه، فأنک لن تأتي في باب خُصومته، ووجيع مكيدته أبلغ مِنَ الإمساک عن جوابه، والإعراض عن خطابه، لأنَّ غرضه مِن مُناظرتک :

أ- أن يفتنک فتتبعه فتهلک.

ب- أو ييأس منک، فيشفي غيظه أن يُسمعک في دينک ما تكرهه.

فأخسئه بالإمساک عنه، وأذلِلهُ بالقطيعةله.

أليسَ قد أخبرتک بقول الحسن حين قال له القائل: يا أبا سعيد، تعال حتى أخاصمک في الدين. فقال له الحسن: أما أنا فقد أبصرتُ ديني، فإن كنت قد أضللت دينک، فالتمسه.

وأخبرتک بقول مالک حين جاءه بعض أهل الأهواء، فقال له: أما أنا فعلى بينة مِن ربي، وأما أنت فشاکٌّ فاذهب إلى شَّاک مثلک فخاصمه.

فهل يأتي في جواب المخالف مِن جميع الحُجج حُجَّة هي أسخن لعينه، ولا أغيظ لقلبه مِن مثل هذه الحُجَّة والجواب؟

أما سمعت قول مصعب بن سعد: لا تُجالس مفتونًا، فإنه لن يُخطئك إحدى اثنين: إما أن يفتنك فتتبعه. وإما أن يؤذيك قبل أن تفارقه.

وأيوب السختياني حين قال له الرَّجُل: أكلمك بكلمة، فولى عنه، وأشار بإصبعه، وقال: ولا نصف كلمة.

وعبدالرزاق حين قال لابن أبي يحيى: القلب ضعيف، وليس الدين لَمَن غَلب.

حدثنا أبو طلحة أحمد بن محمد الفزاري، قال: حدثنا عبدالله بن خُبيق، قال: حدثنا عبدالله بن داود، قال: قال الأعمش: السُّكوت جواب.

حدثنا ابن دُريد، قال: حدثنا الرياشي، قال: حدثنا الأصمعي، قال: سمعت شبيب بن شيبة، يقول: من صبر على كلمةٍ: حَسَمَها، ومَن أجاب عنها استدَّرها.

فإن كنت ممن يريد الاستقامة، ويؤثر طريق السلامة، فهذه طريق العلماء، وسبيل العقلاء، ولك فيما انتهى إليك مِن علمهم وفعلهم كفاية وهداية،

وإن كنت ممن قد زاغَ قلبه، وزلَّت قَدَمه وأنت متحيزٌ إلى فئة الضلالة وحزب الشيطان، قد أَنست بما استوحش منه العقلاء، ورغبت فيما زَهِدَ فيه العلماء، قد جعلت القوم بطانتك وخزانتك، قد استبشرت جوارحك بلقائهم، وأَنس قلبك بحديثهم، فقد جعلت ذريعتك إلى مجالستهم، وطريقك إلى محادثتهم، أنك تريد بذالك مُناظرتهم، وإقامة الحُجَّة عليهم، ورَدّ بالهم إليهم، فإن تَكُ بَهرجَتُكَ خفيت على أَهل الغفلة مِنَ الأَدميين، فلن يخفى ذالك على مَن يعلم خائنة الأَعين وما تخفي الصدور.

الإبانة الكبرى لابن بطة | **(١/صـ : ٢٧١-٢٧٧)**



# زەمی کەلام و ئەهلەکەی لای ئیمامی شافعی و ئیمامی أحمد

هەردوو أبو عبدالله ـ کە ئیمامی شافعی و ئیمامی أحمد یەکێکن لەو کەسانەی دژی ئەهلی کەلام بوون، وە زۆر توند بوون بەرامبەریان، هیچ کات نەبووە کەلام لێیانەوە دەرچوو بێ، وە نەبووە ئامۆژگاری کەسێک یاخود قوتابییەکیان بکەن کە تەماشای کتوبی کەلام بکەن و لەگەڵ ئەهلی کەلام دابنیشن و ڕەدیان بدەنەوە، بەڵکو ئەوەی لێیانەوە سابت بووە بێزراوی کەلام و ئەهلەکەی بووە، وە بە هیچ شێوەیەک قسەیان تێدا نەکردووە، ئەگەریش لە حاڵەتێکدا کەسێک لە مەجلسیاندا بابەتێکی کەلامی کردبێتەوە، ئەوە زۆر بە توندی ڕەدیان داوەتەوە و زەجریان کردووە و هاواریان کردووە بەسەریدا، وە بابەتە کەلامییەکانیان وەک دەسپێکی شیرک بینیوە، وە حوکمی ئەهلەکەشیان بە هەجر و دارکاری و دوورخستنەوە بینیوە.

**یونس بن عبدالأعلی** دەڵێ: بیستم شافعي دەیوت: ئەگەر عەبد گیرۆدە و موبتەلای هەموو تاوانێک بێ کە الله ﷻ نەهی لێکردووە بێجگە لە

شیرک، باشترە بۆی لە کەلام، من هەندێک شتم بیستووە و بینیوە لە ئەصحابی کەلام گومانم نەدەکرد موسڵمان شتی وا بڵێ.

حدثنا يونس بن عبدالأعلى المصري، قال: سمعت الشافعي، يقول: لأن يُبتلى العبد بِكُل ما نهى الله عنه -سوى الشرك- خير له مِنَ الكلام، ولقد اطلعت مِن أصحاب الكلام شيء ما ظننت أَنَّ مسلمًا يقول ذالک.

آداب الشافعي ومناقبه لابن أبي حاتم ا ١٨٩ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٦٨٧ حلية الأولياء لأبي نعيم ا ١٣٣٤٤ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٣٠١

ئەم ئەثەرە لای **اللالكائي** بەم لەفظە هاتووە: تعلم يا أبا موسى، لقد اطلعت مِن أصحاب الكلام على شيء، ما ظننت أَنَّ مسلمًا يقول ذالک.

**الربيع بن سليمان** دەڵێ: شافعي ـم بینی لە پلیکانە دادەبەزی و دەهاتە خوارەوە، کۆمەڵێک کەس لە مەجلسێکدا بوون خەریک بوون دەربارەی شتێک لە کەلام قسەیان دەکرد، هاواری کرد بەسەریاندا، وتی: یان ئەوەتا بە چاکی لەگەڵمان دادەنیشن یاخود هەستن جێمان بهێڵن.

أخبرنا الربيع ابن سليمان المرادي، قال: رأيت الشافعي وهو نازل مِنَ الدَّرَجة، وقوم في المجلس يتكلمون بشيء مِنَ الكلام فصاحَ، فقال: إما أن تجاورونا بخير وإما أن تقوموا عنا.

آداب الشافعي ومناقبه لابن أبي حاتم ا ١٩١ مناقب الشافعي للبيهقي ا صـ: ٢٥٢ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٣٠٤ ذم الكلام وأهله للهروي ا ١١٥١ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٢١٩

لای **اللالكائي** لە جیاتی وشەی « المجلس » وشەی « المسجد » هاتووە.

**يونس بن عبدالأعلى** دەڵێ: بە شافعي ـم وت: دەزانی هاوڕێیان الليث بن سعد چی دەڵێ؟ دەیوت: ئەگەر خاوەنی کەلامت بینی بەسەر ئاودا ڕۆیشت ثقەی پێمەکە و قسەی لەگەڵ مەکە. شافعی وتی: والله هێشتا کەمی وتووە.

أخبرنا أبي، قال: سمعت يونس بن عبدالأعلى رحمه الله، قال: قلت للشافعي: تَروى -أبا عبدالله- ما كان يقول صاحبنا؟ -أُريدُ الليث أو غيره- كان يقول: لو رأيته يمشي على الماء -يعني: صاحب الكلام- لا تثق به، -ولا تعبأ به- ولا تُكلمه. قال الشافعي: فإنه والله قد قَصَّرَ.

آداب الشافعي ومناقبه لابن أبي حاتم | ١٩٢ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٨٨ مناقب الشافعي للبيهقي | صـ : ٢٤٩ حلية الأولياء لأبي نعيم | ١٣٣٧٥ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٩٧ ذم الكلام وأهله للهروي | ١١١٨ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي | ٢٢٨

ئەم ئەثەرە لای **البيهقي** و **الهروي** بەم لەفظە هاتووە: قلت للشافعي: قال صاحبنا الليث بن سعد: لو رأيت صاحب هوى يمشي على الماء ما قبلته. قال الشافعي: أما إنه قَصَّرَ، لو رأيته يمشي في الهواء لما قبلته.

**الربيع بن سليمان** دەڵێ: شافعي لە مزگەوتی گەورە ئامادەبوو، پیاوێک قسەی لەگەڵ دەکرد، مونازەرەکەی درێژەی کێشا، پیاوەکە ڕۆیشت بەرەو بابەتێکی کەلامی، شافعي پێی وت: واز لەمە بهێنە، ئەمە بابەتێکە لە کەلام.

أخبرنا الربيع بن سليمان، قال: حَضَرتُ الشافعي، وكلمه رجل في المسجد الجامع، فطالت مُناظرته إياه، فخرج رجل إلى شيء مِنَ الكلام، فقال له: دَع هذا، فإنَّ هذا مِنَ الكلام.

آداب الشافعي ومناقبه لابن أبي حاتم | ١٩٣ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٩٩ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي | ٢١٢

**الحسن بن عبدالعزيز الجروي** دەڵێ: شافعي زۆر بە توندی نەهی دەکرد لە قسە کردن لە کەلام و هەوا و ئارەزوو، وە دەیوت: یەکێک لەوان کاتێک هاوەڵەکەی موخالەفەی دەکات پێی دەڵێ: کافر بووی، لەکاتێکدا عیلم ئەوەیە تیایدا بوترێ: غەڵەتت کرد و نەتپێکا.

قال الحسن بن عبدالعزيز الجَرَوي: كان الشافعي يَنهى النهي الشديد عن الكلام في الأهواء، ويقول: يقول أحدهم إذا خالفه صاحبه، قال: كفرت، والعلم إنما يقال فيه: أخطأت.

آداب الشافعي ومناقبه لابن أبي حاتم | ١٩٤ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٧٢١ مناقب الشافعي للبيهقي | صـ: ٢٥٤ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٣٠٢ ذم الكلام وأهله للهروي | ١١٣٠

**حرملة** دەڵێ: بیستم محمد بن إدريس الشافعي دەیوت: وریا بن لە تەماشا کردنی کەلام، ئەگەر هاتوو پیاو پرسیاری لێبکرێ دەربارەی

مەسئەلەیەکی فقهی بە غەڵەت وەڵامی بداتەوە، یاخود پرسیاری لێبکرێ دەربارەی پیاوێک هەستاوە بە کوشتنی پیاوێک، لە وەڵامدا بڵێ: خوێنەکەی هێلکەیەکە، ئەوە ئەوپەڕی خەڵکی پێی پێدەکەنن، بەڵام ئەگەر هاتوو پرسیاری لێکرا دەربارەی مەسئەلەیەکی کەلامی ئەویش غەڵەتی کرد، ئەوە بیدعەی دەدرێتە پاڵ و بە ئەهلی بیدەع ناودەهێنرێ.

حدثنا سليمان بن أحمد، حدثنا أحمد بن طاهر بن حرملة، حدثنا جدي حرملة، قال: سمعت محمد بن إدريس، يقول: إياكم والنظر في الكلام، فإنَّ رَجُلًا لو سُئل عن مسألة مِن الفقه فأخطأ فيها أو سُئل عن رَجُلٍ قَتَلَ رَجُلًا، فقال: دِيَتُه بَيضَةٌ، كان أكبر شيءٍ أن يُضحَک مِنه. ولو سُئِل عن مسألَةٍ مِنَ الكلام فأخطَأَ فيها نُسِبَ إلى البدعة.

حلية الأولياء لأبي نعيم ا ١٣٣٥٥ ذيل مناقب الشافعي للبيهقي ا ١٣٦

**إسماعيل بن يحيى المزني** دەڵێ: مەزهەبی شافعي دەربارەی کەلام ئەوەبوو بە کەراهەتی دەبینی قسەکردن و وەڵام دانەوە و ڕۆچوون و قوڵ بوونەوە لە بابەتە کەلامییەکان.

حدثني محمد بن أحمد، المعروف بأبي بكر الصَّواف بمصر وعصام بن الفضل الرازي، قالا: سمعنا إسماعيل بن يحيى المُزَني، قال: كان مذهب الشافعي الكراهية في الخوض في الكلام.

آداب الشافعي ومناقبه لابن أبي حاتم | ٢٠٠ ذم الكلام وأهله للهروي | ١١٣٥ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي | ٢٢١

**الربيع بن سليمان** دەڵێ: بيستم شافعي دەيوت: ئەگەر عەبد لەسەر هەموو تاوانێک بێجگە لە شيرک بمرێ و بگاتەوە خزمەت الله ﷻ، باشترە بۆی هەتا بگاتەوە خزمەتی بە شتانێک لە هەوا و ئارەزوو.

أخبرنا أبو عثمان سعيد بن محمد بن عبدان، قال: سمعت أبا العباس محمد ابن يعقوب الأصَم، يقول: سمعت الربيع بن سليمان، يقول: سمعت الشافعي، يقول: لأن يلقى الله العبد بِكُل ذنب ما خلا الشرك خير مِن أن يلقاه بشيء مِن الهوى.

مناقب الشافعي للبيهقي | صـ: ٢٤٨ حلية الأولياء لأبي نعيم | ١٣٣٤٥ ذم الكلام وأهله للهروي | ١١٣٧ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي | ٢٨٢

**إسماعيل بن يحيى المزني** دەڵێ: لە نێوان و من و پیاوێک مونازەڕەیەک ڕوویدا پرسیاری شتێکی لێکردم وەخت بوو تووشی گومانم بکات لە دینەکەمدا، هاتم بۆ لای شافعي، پێیم وت: ئەوە و ئەوە ڕوویدا لە نێوان من و پیاوێکدا. وتی: تۆ لە کوێ بووی؟ وتم: من لە مزگەوت بووم. پێی وتم: بەڵکو تۆ لە شوێنێک بووی وەک « تاران » شەپۆلەکانی لێتیان داوە. ئەمە پرسیاری مولحیدەکانە وەڵام دانەوەیان ئەوە و ئەوەیە، وە عەبد گیرۆدە و موبتەلای هەرچی خراپە هەیە ببێ کە الله ﷻ دروستی کردووە، باشترە بۆی هەتا گیرۆدە و موبتەلای کەلام ببێ.

وأخبرنا أبو عبدالله الحافظ، قال: أخبرني نصر بن محمد الصوفي، قال: سمعت عبدالرحمن بن حفص الصوفي، يقول: سمعت أبا علي الروذباري، يقول: سمعت ابن بَحر، يقول: سمعت المزني، يقول: دارَ بيني وبين رَجُل مُناظرة فسألني عن كلام كادَ أن يُشَكِّكَني في ديني، فجئت الشافعي، فقلت له: كان مِن الأمر كيت وكيت. قال لي: أين أنت؟ قلت: أنا في المسجد. فقال لي: أنت في مثل « تاران » تلطمك أمواجه. هذه مسألة الملحدين والجواب فيها كيت وكيت، ولأن يبتلى العبد بكل ما خلق الله مِن مضارة خير له مِن أن يبتلى بالكلام.

مناقب الشافعي للبيهقي | صـ: ٢٥١ ذم الكلام وأهله للهروي | ١١٢٥

تاران شوێنێکە لە دەریای سور لەوێدا فیرعەون و سەربازەکانی غەرق بوون و تیاچوون.

**الربيع بن سليمان** دەڵێ: پیاوێک هات مونازەرەی شافعي دەکرد لە بابەتێکدا، شافعي پێی وت: واز لەمە بهێنە، ئەمە تەریقەی ئەهلی کەلامە. وە شافعي گوێی لێبوو دوو پیاو قسەیان دەکرد لە بابەتێکی کەلامیدا. وتی: یان ئەوەتا بە چاکی لەگەڵمان دادەنیشن، یاخود هەستن جێمان بهێڵن.

حدثنا حفص بن عمر، قال: حدثنا أبو حاتم، قال: حدثنا الربيع بن سليمان المرادي، قال: جاء رَجُل يُناظر الشافعي في شيء، فقال: دَع هذا، فإنَّ هذا طريق الكلام. قال: وسَمِعَ الشافعي رجلين يتكلمان في الكلام. فقال: إما أن تجاورانا بخير، وإما أن تقوموا عنا.

الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٨٦

**محمد بن عبدالله بن عبدالحكم** دەڵێ: شافعي وتی: ئەی أبا محمد، ئەگەر پیاوێک پرسیاری لێت کرد دەربارەی بابەتێک لە کەلام وەڵامی مەدەوە، ئەگەر پرسیارت لێبکات دەربارەی خوێنێک، بڵێی: درهەمێکە

یاخود دانقێکە، ئەوکات پێت دەڵێ: غەڵەتت کرد و نەتپێکا، وە ئەگەر پرسیارێکی کەلامیت لێبکات تۆش بخلیسکێی، ئەوە پێت دەڵێ: کافر بووی.

أخبرني أبو عبدالله، قال: أخبرني أبو عبدالله محمد بن إبراهيم المؤذن، عن أبي العباس محمد بن عبدالرحمن -يعني الدغولي- قال: سمعت زكريا بن يحيى، يقول: سمعت محمد بن عبدالله بن عبدالحكم، يقول: قال الشافعي: يا أبا محمد، إن سألك رَجُل عن شيء مِنَ الكلام فلا تجبه، فإنه إن سألك عن دِية، فقلت: درهمًا أو دانقًا، قال ذالك: أخطأت، وإن سألك عن شيء مِنَ الكلام فزللت، قال: كفرت.

مناقب الشافعي للبيهقي ا صـ: ٢٥٢ ذم الكلام وأهله للهروي ا ١١٣٢

دانق وردەی درهەمە، بەشێکە لە شەش بەشی درهەم، وەزنەکەی یەکسانە بە هەشت دەنک جۆ.

**محمد بن إسماعيل** دەڵێ: بیستم ثور لەگەڵ حسين دەیانوت: بیستمان شافعي دەیوت: حوکمی من بۆ ئەهلی کەلام ئەوەیە بە پەلکی دارخورما لێیان بدرێ، وە سواری حوشتر بکرێن و بەناو هۆزەکاندا بگەڕێندرێن و

بوترێ: ئەوە پاداشتی ئەو کەسانەیە کە تەرکی قورئان و سوننە دەکەن، وە ڕوو دەکەنە کەلام.

أخبرنا أبو عبدالرحمن السلمي، قال: حدثنا أبو نصر محمد بن علي بن طلحة المروروذي، قال: حدثنا أبو سعيد أحمد بن علي الأصبهاني، قال: حدثنا زكريا بن يحيى الساجي، قال: حدثني محمد بن إسماعيل، قال: سمعت ثور وحسينًا، يقولان: سمعنا الشافعي يقول: حُكمي في أهل الكلام أن يضربوا بالجريد، ويحملوا على الإبل ويُطاف بهم في العشائر والقبائل، وينادى عليهم: هذا جزاء مَن ترک الكتاب والسنة وأقبل على الكلام.

مناقب الشافعي للبيهقي ا صـ : ٢٥٤ حلية الأولياء لأبي نعيم ا ١٣٣٧١ جامع بيان العلم لابن عبدالبر ا ١٧٩٤ ذم الكلام وأهله للهروي ا ١١٤٢ الحجة على تارک المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٢٤٥

ئەم ئەثەرە لای **إبن عبدالبر** و **الهروي** لە ڕێگەی الحسن بن محمد الزعفرانی لە شافعی ـیەوە ڕیوایەتیان کردووە.

**الحسن بن محمد الزعفراني** دەڵێ: شافعي ڕقی لە کەلام بوو، وە نەهی لێدەکرد.

أخبرنا محمد بن أحمد بن محمد الحافظ، أخبرنا إبراهيم بن محمد الشهيد، حدثنا زكريا بن يحيى، حدثنا الزعفراني، قال: كان الشافعي يَكره الكلام، وينهى عنه.

ذم الكلام وأهله للهروي | ١١٥٦

**أبو ثور** دەڵێ: بیستم شافعي دەیوت: هیچ کەسێک نەبووە شوێن کەلام بکەوێت و هەڵگری کەلام بێ سەرکەوتوو بووبێ.

حدثنا أحمد بن أصرَم المُزني -مِن وَلد عبدالله بن المُغَفَّل- قال: قال أبو ثَور: سمعت الشافعي، يقول: ما تَرَدَّى أَحَدُ بالكلام فأَفلَحَ.

آداب الشافعي ومناقبه لابن أبي حاتم | ١٩٥ كتاب السنة للخلال | ٢٤٠٥ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٩٠ مناقب الشافعي للبيهقي | صـ : ٢٥٤ حلية الأولياء لأبي نعيم | ١٣٣٤٦ شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٣٠٣

**يونس بن عبدالأعلى** دەڵێ: بیستم شافعي دەیوت: دایکی بشر المريسي پێی وتم: قسە لەگەڵ المريسي بکە با واز لە کەلام بهێنێ، وە قوڵ نەبێتەوە تیایدا، قسەم لەگەڵی کرد هەتا تەرکی کەلام بکات، بەڵام بانگی دەکردم بۆ کەلام.

حدثنا أبي، قال: أخبرني يونس بن عبدالأعلى، قال: سمعت الشافعي، يقول: قالت لي أُم بِشر المَريسي: كَلِم المَريسي أن يَكُفَ عَن الكلام والخوض فيه، فكلمته في ذالک، فدعاني إلى الكلام.

آداب الشافعي ومناقبه لابن أبي حاتم | ١٩٧ الإبانة الكبرى لابن بطة | ٦٨٩/أ ذيل مناقب الشافعي للبيهقي | ١٣٧ ذم الكلام وأهله للهروي | ١١٦٢

ئەم ئەثەرە لای **إبن بطة** بەم لەفظە هاتووە: كلمتني أُم بعض أصحاب الكلام على أن أُكَلِّمَ ابنها ليَكُفَّ عن الخوض في الكلام، قال: فكلمته ليَكُفَّ عنِ الكلام، فَدَعاني إلى الكلام.

وتم: ئەمە دەلیلێکی وازحە کە خۆ هیلاک کردن و جیدال و مونازەڕە لەگەڵ ئەهلی باتڵ سوودی نییە، هەرچەندە هەوڵ بدەی بانگیان بکەی

بۆ حەق و ڕێگای ڕاست، بەڵام ئەوان زیاتر سوور دەبن لەسەر عەقیدەکەی خۆیان، هەروەک چۆن بشر المريسي ویستویەتی ئیمامی شافعي بانگ بکات بۆ باتڵ و جەهمی بوون!

**محمد بن عبدالله بن عبدالحکم** دەڵێ: بیستم شافعي دەیوت: ئەگەر خەڵکی بیانزانیبا چی لە کەلام و هەوا و ئارەزوودا هەیە ئەوە لێی هەڵدەهاتن، هەروەک چۆن لە شێر هەڵدێن.

حدثنا محمد بن عبدالرحمن، حدثنا محمد بن يحيى بن آدم، حدثنا محمد بن عبدالله بن عبدالحكم، قال: سمعت الشافعي، يقول: لو عَلِمَ الناس ما في الكلام والأهواء لَفَرّوا مِنه، كما يَفِرّون مِنَ الأسد.

حلية الأولياء لأبي نعيم ا ١٣٣٤٧ الإنتقاء لابن عبدالبر ا صـ: ١٩٩ ذم الكلام وأهله للهروي ا ١١٥٩

**محمد بن داود** دەڵێ: لە هەموو تەمەنی شافعي لێوەی سابت نەبووە قسەی کردبێ لە مەسئەلەیەک لە هەوا و ئارەزوودا، وە هیچ کات قەولێک لەو بابەتە نەدراوەتە پاڵ شافعي سەرەڕای ئەو هەموو ڕقەی هەی بووە لە کەلام و ئەهلی بیدەع.

أخبرتنا فاطمة بنت القاسم بن محمد، قالت: أخبرنا الحسين بن شعيب، أخبرنا الحسين بن محمد بن الحسين، حدثنا عبيدالله بن محمد بن شنبة، حدثني محمد بن إسحاق السني، سمعت عبدالله بن أحمد بن حنبل، يقول: سمعت محمد بن داود يقول: لم يُحفظ في دهر الشافعي كله أنه تكلم في شيء مِنَ الأهواء، ولا نُسِبَ إليه ولا عُرِفَ به مع بُغضه لأهل الكلام والبدع.

ذم الكلام وأهله للهروي ١١٢٦

**الربيع بن سليمان** دەڵێ: شافعي پێی وتم: ئەگەر بمویستایە لە ڕەدی هەموو کەسێکی موخالفدا کتێبێکی گەورە بنوسم ئەوە دەمتوانی، بەڵام ئەوەم نەکردووە، چونکە کەلام لە صیفات و ئیشی من نییە، وە پێشم خۆش نییە هیچ شتێکی کەلام بدرێتە پاڵم.

وأخبرنا السلمي فيما بلغه عن الربيع، قال: قال الشافعي: لو أَرَدتُ أَن أَضَع على كُل مخالف لي كتابًا كبيرًا لفعلتُ، ولكن ليس الكلام مِن شأني ولا أُحب أن يُنسَب إلي مِنه شيء.

ذيل مناقب الشافعي للبيهقي ١٣٣ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ٢٢٠

**أحمد بن حنبل** دەڵێ: هەرکات خەبەرێک لای شافعي سابت بووایە ئەوە وەریدەگرت و تەقلیدی دەکرد، باشترین صیفەت تیایدا ئەوەبوو حەزی لە کەلام نەبوو، بەڵکو خواست ویستی ئەو فیقهـ بوو.

أخبرني عبدالله بن أحمد بن حنبل فيما كَتَبَ إليه، قال: سمعت أبي، يقول: كان الشافعي إذا أُثبتَ عنده الخبر، قَلَّدَه، وخير خصلة كانت فيه لم يكن يشتهي الكلام، إنَّما هِمَّته الفقه.

آداب الشافعي ومناقبه لابن أبي حاتم | ٦٦ ذيل مناقب الشافعي للبيهقي | ١٣٥ ذم الكلام وأهله للهروي | ١١٢٧ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي | ٢٥٢

**حنبل بن إسحاق** دەڵێ: بیستم أبا عبدالله أحمد بن حنبل دەیوت: دەست بگرن بە سوننە و حدیثەوە، وە ئەوەی الله ﷻ سودتانی پێدەگەیێنێ، وە وریا بن لە موجادەلە و مشتومڕ و قوڵبوونەوە، ئەو کەسەی کەلامی خۆشدەوێ سەرکەوتوو نابێ، وە هەرکەسێک بابەتێکی کەلامی داهێنابێ ئیللا لە کۆتاییدا بەرەو بیدعە چووە، چونکە کەلام خێری تێدا نییە و بەرەو خێرت نابات، وە من کەلامم خۆشناوێ ڕقم لێیەتی، بە هەمان شێوەش ڕۆچوون و قوڵبوونەوە و جیدال و مشتومڕم

خۆشناویێ، دەست بگرن بە سوننەن ئاثارەوە، وە بە فیقهیشەوە کە سودتان پێدەگەیێنێ، وە واز لە جیدال و مشتومڕو وتەی ئەو کەسانە بهێنن کە لە ڕێگەی حەق لایانداوە، گەیشتووین بە خەڵکی و کەسانی پێش خۆمان ئەم کەلامەیان نەدەزانی، وە نزیکی ئەهلی کەلام نەدەکەوتنەوە، وە عاقیبەتی کەلام بەرەو خێر ناڕوات، الله ﷻ ئێمە و ئێوەش بپارێزێ لە فیتنە، وە ئێمە و ئێوەش سەلامەت بکات لە هەموو تیاچوونێک.

حدثني عبيدالله بن حنبل، قال: حدثني أبي، قال: سمعت أبا عبدالله، يقول: عليكم بالسُّنَّة والحديث، وما ينفعكم الله به، وإياكم والخوض والجِدال والمِراء، فإنه لا يُفلح مَن أَحَبَّ الكلام، وكُل مَن أحدث كلامًا لم يكن آخر أمره إلا إلى بدعة، لأن الكلام لا يدعو إلى خير، ولا أُحبُّ الكلام، ولا الخوض، ولا الجِدال، وعليكم بالسُّنن والآثار والفقه الذي تنتفعون به، ودعَوا الجِدال، وكلام أهل الزيغ والمِراء، أدركنا الناس ولا يعرفون هذا، ويُجانبون أهل الكلام، وعاقبة الكلام لا تؤول إلى خير. أعاذنا الله وإياكم مِن الفتن، وسَلَّمَنا وإياكم مِن كُلِّ هَلَكَة.

كتاب السنة للخلال ا ٢٣٩٦ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٧٠٢ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٢٣٠

**أبو بكر المروذي** دەڵێ: أبا عبدالله أحمد بن حنبل دەیوت: هەرکەسێک خەریکی کەلام بێ، وە مەشغوڵ بێ پێوەی سەرکەوتوو نابێ، هەرکەسێک خەریکی کەلام بێ، ئەوە دوور نییە لە جەهمی بوون و ببێتە جەهمی.

وە بیستم أبا عبدالله دەیوت: من قسە ناکەم ئیللا لەوەدا نەبێ کە لە قورئان و سوننە و ئاثاری صەحابە و تابعین هاتووە، ئەمما غیری ئەوانە، ئەوە قسە کردن تیایدا باش نییە و سوپاس کراو نییە.

أخبرنا المروذي، سمعت أبا عبدالله، يقول: مَن تعاطى الكلام لا يُفلح، مَن تعاطى الكلام لم يَخلُ مِن أن يتجهم.

وسمعت أبا عبدالله، يقول: لست أتكلم إلا ما كان مِن كتاب أو سُنَّة، أو عن الصحابة والتابعين، وأما غير ذالک، فالكلام فيه غير محمود.

كتاب السنة للخلال ا ٢٣٩٨ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٦٩٩

**حنبل بن إسحاق** دەڵێ: بیستم أبا عبدالله أحمد بن حنبل دەیوت: ئەو کەسەی کەلامی خۆشدەوێ سەرکەوتوو نابێ، وە عاقیبەتی ئەهلی کەلام بەرەو خێر ناڕوات.

وە بیستم دەیوت: دەست بگرن بە سوننە و حدیثەوە، وە وریا بن واز بهێنن لە جیدال و مشتومڕ و قوڵبوونەوە، چونکە ئەو کەسەی کەلامی خۆشبوێ سەرکەوتوو نابێ.

وە پێی وتم: لەگەڵیان دامەنیشە، وە قسە لەگەڵ هیچ یەکێکیان مەکە. پاشان وتی: گەیشتووین بە خەڵکی و کەسانی پێش خۆمان ئەم کەلامەیان نەدەزانی، وە نزیکی ئەهلی کەلام نەدەکەوتنەوە، وە عاقیبەتی کەلام بەرەو خێر ناڕوات.

وە بیستم دەیوت: کەسێکم نەبینیوە خەریکی کەلام بێت و شوێنی بکەوێت و حەزی لێبکات سەرکەوتوو بێ، چونکە بەرەو بابەتێکی زۆر گەورە و مەترسیداری دەبات، لە ئێستادا قسەیان لە شتێکدا کردووە، دڵم هێزی ئەوەی تێدا نییە باسی بکەم و زمانم نایەتەگۆ هەتا بیگێڕمەوە.

وقال حنبل: سمعت أبا عبدالله، يقول: مَن أحب الكلام لم يفلح، لا يؤول أمرهم إلى خير.

وسمعته، يقول: عليكم بالسُّنَّة والحديث وإياكم والخوض والجِدال والمِراء، فإنه لا يُفلح مَن أَحبَّ الكلام.

وقال لي: لا تُجالسهم، ولا تُكلِّم أحدًا منهم. ثم قال: أدركنا الناس وما يعرفون هذا، ويجانبون أهل الكلام، وعاقبة الكلام لا تؤول إلى خير.

وسمعته، يقول: ما رأيت أحدًا طلب الكلام واشتهاه فأفلح، لأنه يخرجه إلى أمر عظيم، لقد تكلموا يومئذ بكلام، واحتجوا بشيء ما يقوى قلبي ولا ينطلق لساني أن أحكيه.

كتاب السنة للخلال | ٢٣٩٩

**أحمد بن أصرم المزني** دەڵێ: من جار جار ڕەدی ئەهلی کەلامم دەدایەوە. أحمد بن حنبل پێی وتم: دروست نییە جیدال و مشتومڕ. وە چوویە مزگەوتەوە نوێژی کرد، کاتێک تەواو بوو هەستا بڕوات، وتی: عباس تۆی؟ وتی: بەڵێ. پێی وت: اتق الله، دروست نییە خۆت تەرخان بکەی بۆ ڕەد دانەوە و ناوبانگت هەبێ بە کەلام، وە کتێب بنوسی لەسەریان، ئەگەر ئەوە خێری تێدا بووایە، ئەوە صەحابە رضي الله عنهم پێشی ئێمە دەکەوتن تیایدا، وە هیچ کتێبێکم نەدیوە لەوانە، ئەمە هەمووی بیدعەیە.

وتی: هەرچیت وت هەمووی قبوڵ دەکەین ئەی أبا عبدالله، وە تەوبە دەکەم و ناگەڕێمەوە سەری، ئیتر بە دوایان ناکەوم، وە تەقە نادەم لە

دەرگایان، بەڵام دەبیستم قسە دەکەن لە بابەتە کەلامییەکاندا، وە یەک کەس نییە ڕەدیان بداتەوە، بۆیە خەم دەخۆم و ئارامم نامێنێ و ڕەدیان دەدەمەوە. وتی: ئەگەر یەکێک لەوانە هات پرسیارێ فێربوون بکات وەڵامی بدەوە و ڕێنمونی بکە. ئەمەی چەندین جار دووبارە کردەوە.

أخبرنا أحمد بن أصرم المزني، قال: إني ربما رددت عليهم. قال أحمد: لا ينبغي الجِدال. ودخل أحمد المسجد وصلى، فلما انفتل، قال: أنت عباس؟ قال: نعم. قال: اتق الله، ولا ينبغي أن تنصب نفسک وتشتهر بالكلام، ولا بوضع الكتب، ولو كان هذا خيرًا لتقدمنا فيه الصحابة رضي الله عنهم، ولم أر شيئًا مِن هذه الكتب، وهذه كلها بدعة.

قال: مقبول منک يا أبا عبدالله، أستغفر الله وأتوب إليه، إني لست أطلبهم، ولا أدقّ أبوابهم، ولكن أسمعهم يتكلمون بالكلام وليس أحدًا يرد عليهم، فأغتم ولا أصبر حتى أرد عليهم. قال: إن جاءک مسترشد فأرشده. قالها مرارًا.

كتاب السنة للخلال | ٢٤٠٠

**أبا الحارث** دەڵێ: پرسیارم کرد لە أبا عبدالله أحمد بن حنبل، وتم: لێرە کەسێک هەیە مونازەڕەی جەهمییەکان دەکات، هەڵەکانیان دەردەخات،

وردبینی دەکات لەسەر مەسائیلەکانیان و ڕوونی دەکاتەوە، ڕات چییە؟ وتی: نایبینم و ڕێگە نادەم بە قسەکردن لەم هەوا و ئارەزووانە، وە نایبینم و ڕێگە نادەم مونازەرەیان لەگەڵ بکرێ، مەگەر معاوية بن قرة ناڵێ: ناکۆکی و مشتومڕ کردەوەکان بەتاڵ دەکاتەوە؟ کەلام خراپ و پیسە، خاوەنەکەی بەرەو خێر نابات، خۆتان بە دوور بگرن لە ئەهلی کەلام و جیدال، دەست بگرن بە سوننەوە وە ئەوەی ئەهلی عیلم پێش ئێوە لەسەری بوون، ئەوان ڕقیان لە کەلام و ڕۆچوون و قوڵبونەوە بوو لەگەڵ ئەهلی بیدەع، بەڵکو سەلامەتی و ڕزگاربوون لە تەرک کردنیدایە، ئەمرمان پێنەکراوە بە موجادەلە و مشتومڕ و ناکۆکی، وە وتی: ئەگەر کەسێکتان بینی کەلامی خۆشویست، ئەوە خۆتانی لێبپارێزن.

أخبرنا محمد بن أبي هارون ومحمد بن جعفر: أن أبا الحارث حدثهم، قال: سألت أبا عبدالله، قلت: إن ههُنا مَن يناظر الجهمية، ويُبَيِّن خطأهم، ويدقق عليهم المسائل، فما ترى؟

قال: لست أرى الكلام في شيءٍ مِن هذه الأهواء، ولا أرى لأحدٍ أن يناظرهم، أليس قال معاوية بن قُرَّة: الخصومات تحبط الأعمال؟ والكلام رديء، ولا يدعو إلى خير، تجنبوا أهل الجِدال والكلام، وعليكم بالسُّنن

وما كان عليه أهل العلم قبلكم، فإنهم كانوا يكرهون الكلام والخوض مع أهل البدع، وإنما السلامة في ترك هذا، لم نُؤمر بالجِدال والخصومات. وقال: إذا رأيتم مَن يحب الكلام فاحذروه.

كتاب السنة للخلال ا ٢٤٠١ الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٧٠٤

**أبو الحارث الصايغ** دەڵێ: بیستم أبا عبدالله أحمد بن حنبل دەیوت: هەرکەسێک کەلامی خۆشویست، ئەوە لە دڵی ناچێتە دەرەوە، وە قەت نابینی خاوەن کەلام سەرکەوتوو ببێ.

وحدثني أبو صالح، قال: حدثنا أبو جعفر محمد بن داود، قال :حدثنا أبو الحارث الصايغ، قال: سمعت أبا عبدالله، يقول: مَن أَحَبَّ الكلام لم يخرج مِن قلبه، ولا ترى صاحب كلام يُفلح.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٧٠١

وە دەڵێ: بیستم **أبا عبدالله أحمد بن حنبل** دەیوت: خاوەنی کەلام خۆشەویستی کەلام لە دڵی دەرناچێ، قەت سەرکەوتوو نابێ، هەرکات قسە دەکات بە داهێنراوێک، ئەوە نەفسی خۆی تەرخان دەکات بۆ دیفاع کردن لێی.

قال: وسمعت أبا عبدالله، يقول: صاحب كلام لا يخرج حُبُّ الكلام مِن قلبه، إنه لا يُفلح كلما تَكلَّمَ بمحدثةٍ حَمَلَ نفسه على الذبِّ عنها.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٧٠٤/أ

وە دەڵێ: بیستم **أبا عبدالله أحمد بن حنبل** دەیوت: ئەگەر پیاوێکت بینی کەلامی خۆشدەویست، ئەوە وریا و ئاگاداری خۆتبە لێی.

قال: وسمعت أبا عبدالله، يقول: إذا رأيت الرَّجُل يُحِبُّ الكلام فاحذره.

الإبانة الكبرى لابن بطة ا ٧٠٤/ب

**موسى أبو عمران الأصبهاني** دەڵێ: بیستم أحمد بن حنبل دەیوت: لەگەڵ ئەهلی کەلام دامەنیشە، تەنانەت ئەگەر دیفاع لە سوننە بکەن.

قال ابن أبي داود: حدثنا موسى أبو عمران الأصبهاني، قال: سمعت أحمد بن حنبل، يقول: لا تُجالس أصحاب الكلام، وإن ذَبوا عَنِ السُّنَة.

كتاب السنة للخلال ا ٢٤٠٢ مناقب الإمام أحمد بن حنبل لابن الجوزي ا صـ : ٢١٠

ئەم ئەثەرە لای **إبن الجوزي** بەم لەفظە هاتووە: لا تُجالسوا أَهل الكلام وإن ذَبوا عَنِ السُّنَة.

**الميموني** دەڵێ: بیستم أحمد بن حنبل دەیوت: بەردەوام و هەمیشە کەلام لای ئەهلی خێر زەم کراو بووە.

وقال الميموني: سمعت أحمد بن حنبل، يقول: ما زال الكلام عند أهل الخير مذمومًا.

كتاب السنة للخلال | ٢٤٠٣

**حرب بن إسماعيل الكرماني** دەڵێ: پرسیار کرا لە أحمد بن حنبل دەربارەی سەیر کردن و مەشغوڵ بوون بە ڕەئیەوە؟ نەهی لێکرد و ڕقی لێی بوو.

سُئِل أحمد بن حنبل عنِ النظر في الرأي؟ فكَرِهه، ونهى عنه.

كتاب السنة لحرب الكرماني | ٥٩٣ ذم الكلام وأهله للهروي | ٤١١

**حرب بن إسماعيل الكرماني** دەڵێ: وترا بە أحمد بن حنبل: پیاوێک مەسئەلەیەکی بۆ دێتە پێش، کەس نادۆزێتەوە پرسیاری لێبکات، ئایا

پرسیار لە ئەهلی ڕەئی بکات؟ وتی: نەخێر بە هێچ شێوەیەک دەربارەی هیچ شتێک پرسیار لە ئەهلی ڕەئی ناکرێت.

قيل لأحمد بن حنبل: رجل نزلت به مسألة، فلم يجد مَن يسأله، أيسأله أهل الرأي؟ قال: لا يسأل أهل الرأي عن شيء البتَّة.

كتاب السنة لحرب الكرماني ا ٥٩٤ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٤١٣



# غەیبەتی ئەهلی بیدەع و باس کردنی حاڵ و عەیبەکانیان

قسە کردن لەسەر ئەهلی بیدەع و تەعن لێدانیان و باس کردنی حاڵ و وەزعیان و حوکمدان لەسەریان بەو خەلەل و عەقیدە باتڵەی هەیانە بەشێکە لە عیلم، هەروەک چۆن شتێکی پێویستە مەسائیلی فیقهی فێری خەڵکی بکرێت و پێیان بگەیێنرێ، بەهەمان شێوەش پێویستە ئەهلی بیدەع بە خەڵکی بناسێنرێن و حاڵیان بۆ خەڵکی ڕوون بکرێتەوە، لای ئەهلی سوننە لە کۆن و نوێ ئەمە مەنهەج بووە و هیچ کێشەیەکی تێدا نەبووە، بە پێچەوانەی خەڵکانی ئەم سەردەمە کاتێک تۆ دەڵێی فلانە کەس مورجیئە و قەدەری و موعتەزیلە و جەهمی و ئەشعەرییە، پێت دەڵێن واز لە غەیبەت کردنی فڵان و فیسار بهێنن، لەکاتێکدا سەلەف ئەمەیان بە غەیبەت نەبینیوە و لەم بابەتەدا دەیان کتێبیان نوسیوە، وەک کتێبەکانی الجرح والتعديل تیایدا سەدان و هەزاران ڕاوی لاواز و موتەهەمیان هێناوە، وە بە ئاشکرا و بێ ترس و سڵ کردنەوە وتوویانە: فڵان لاوازە، ثقە نییە، مەتروکە، وتەی هیچ نییە و فلسێ ناهێنێ، درۆزنە، ئەمە سەلەف وەک دین سەیریان کردووە و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ

کردووە، هیچ کات غەیبەت نەبووە لایان، بگرە وەک عیبادەت و نزیک بوونەوە لە الله ﷻ سەیریان کردووە.

**عاصم الأحول** دەڵێ: قتادة وتی: یا أحول، ئەگەر پیاوێک بیدعەیەکی داهێنا، ئەوە پێویستە باس بکرێت و خەڵکی لێ ئاگادار بکرێتەوە.

أخبرنا أحمد بن عبيد، قال: أخبرنا محمد بن الحسين، قال: حدثنا أحمد بن زهير، قال: حدثنا هدبة، قال: حدثنا حزم بن أبي حزم قال: حدثنا عاصم الأَحْوَل قال: قال قتادة: يا أَحوَل، إنَّ الرجل إذا إبتدع بدعة، ينبغي لها أن تذكر حتى تحذر.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي | ٢٥٦

**الأعمش** دەڵێ: إبراهيم النخعي نەیدەبینی کەسی موبتەدع غەیبەتی هەبێ.

أخبرنا مَخلَد بن مالكٍ، حدثنا عبدالرحمن بن مَغراء، حدثنا الأعمَش، قال: كانَ إبراهِيمُ لا يَرى غيبَةً لِلمُبتَدِع .

سنن الدارمي | ٤٠٦

ئەم ئەثەرە لای **اللالكائي** بەم لەفظە هاتووە: عن الأعمش، عن إبراهيم النخعي قال: لَيسَ لِصَاحب بِدعَة غيْبَة.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٧٦

**حسن البصري** دەڵێ: ئەهلی بیدەع غەیبەتیان نیە.

أخبرنا عبدالعزيز بن محمد، قال: حدثنا الحسين بن يحيى، قال: حدثنا عبدالله بن أيوب، قال: حدثنا رَوح، قال: حدثنا الرَّبيعْ بِنْ صَبِيحْ، عَنِ الحَسَنِ قَال : لَيسَ لِأَهْلِ البِدَعِ غَيبَة.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة للالكائي ا ٢٨٠ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٦٩٩ الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٣١٣

**الصلت بن طريف** دەڵێ: بە حسن البصري ـم وت: پیاوی فاجر و خراپەکار کە خراپەکارییەکانی بە ئاشکرا ئەنجام دەدات و ئاشکرای دەکات، من هەڵدەستم بە باس کردنی ئەوەی تیایدایە ئایا غەیبەتە؟ وتی: نەخێر غەیبەت نییە، هیچ ڕێزێکی نییە ولا كرامة.

أخبرنا علي بن محمد بن عبدالله بن بِشران، قال: أخبرنا أحمد بن محمد بن جعفر الجوزي، قال: حدثنا أبو بكر بن أبي الدنيا، قال: حدثنا يحيى

بن جعفر -وهو ابن أبي طالب- قال: حدثنا عبدالملک بن إبراهيم الجُدِّيُ، قال: حدثنا الصَّلتُ بن طَريف، قال: قلت للحَسَن: الرَجُل الفاجِر المعلن بفجوره ذِكري له بما فيه، غيبة له؟ قال: لا، ولا كرامة.

الكفاية في معرفة أصول علم الرواية للخطيب ا ٧٩ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٦٩٤

**زائدة الثقفي** دەڵێ: بە منصور بن المعتمر ـم وت: ئەو کاتانەی بە ڕۆژووم بە خراپە باسی فەرمانڕەوا بکەم؟ وتی: نەخێر. وتم ئەی باسی ئەهلی بیدەع و هەوا و ئارەزوو بکەم؟ وتی: بەڵێ.

وقال زائدة الثقفي: قلت لمنصور بن المعتمر: أرأيتَ إذا كنت صائمًا أتناول السلطان؟ قال: لا. قلت: فأصحاب الأهواء والبدع؟ قال: نعم.

الحجة على تارک المحجة لأبي الفتح المقدسي ا ٣١٤

وتم: سەرنج بدەن لە کاتی ڕۆژوودا ڕێگەی نەداوە باسی خراپە و نەقصەکانی فەرمانڕەوا بکرێ، هەرچەندە موستەحەقیش بووبێ بە باسکردن، بەڵام ڕێگەی داوە بە باس کردنی باتڵ و عەیب و عارەکانی

ئەهلی بیدەع، چونکە زەرەری ئەمان زیاترە بۆ خەڵکی هەتا فەرمانڕەواکە، هەرچەندە ئەویش غەڵەت و خەلەلی زارەکی و کرداری تێدابێ.

**مكي بن إبراهيم** دەڵێ: شعبة بن الحجاج ئەهات بۆ لای عمران بن حدير، پێی دەوت: هەستە لەگەڵمان وەرە هەتا لە پێناو الله ﷻ غەیبەت بکەین.

حدثنا لقمان بن علي، قال: حدثنا عبدالصمد بن الفضل، قال: حدثنا مَكِي، قال: كانَ شُعبَة يَجِئ إلى عِمران بن حُدَير، فيقول: قُم بنا حتى نَغتاب في الله تعالى.

كتاب المجروحين لابن حبان ا **(٩٥/١)** كتاب الضعفاء للعقيلي ا **(٣١/١)** الكامل في ضعفاء الرجال لابن عدي ا **(٣٢٨/١)** الكفاية في معرفة أصول علم الرواية للخطيب ا ٨٩ ذم الكلام وأهله للهروي ا ٦٩٥

ئەم ئەثەرە لای **أبو جعفر العقيلي** بەم لەفظە هاتووە: قال النضر بن شميل: سمعت شُعبة بن الحجاج يقول: تعالوا نَغتاب في الله.

**حنبل بن إسحاق** دەڵێ: بيستم أبا عبدالله أحمد بن حنبل دەیوت: خەڵکی پێویستان بە نەرمی و لەسەرخۆییە لە فەرمان کردن بە چاکە و

ڕێگری کردن لە خراپە دوور لە توندی و تووڕەیی، ئیللا مەگەر پیاوێک تاوان و فاسقیەکەی ئاشکرا بکات، ئەوکات واجبە لەسەرت ڕێگری لێبکەیت و باسی بکەیت، چونکە وتراوە: کەسی فاسق حورمەتی نییە، ئەمەش هیچ حورمەت و ڕێزێکی نییە.

أخبرنا عصمة بن عصام، قال: حدثنا حنبل أنه سمع أبا عبدالله، يقول: والناس يحتاجون إلى مدارة ورفق في الأمر بالمعروف بِلا غلظة، إلا رجلاً مباينًا معلنًا بالفسق، والردى فيجب عليک نهيه وإعلامه، لأنه يقال: ليس لفاسق حُرمة، فهذا لا حُرمة له.

كتاب الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر للخلال ا ٣٣

**أبو زرعة الدمشقي** دەڵێ: بیستم أبا مسهر عبدالأعلى بن مسهر پرسیاری پیاوێکیان لێکرد: غەڵەت دەکات، وە تۆمەتبارە بە درۆ، وە بە غەڵەت دەخوێنێتەوە پێچەوانەی دەقە ڕاستەکەی؟ وتی: حاڵی ڕوون بکەرەوە بۆ خەڵکی. بە أبي مسهر ـم وت: ئایا وای دەبینی ئەمە غەیبەتە؟ وتی: نەخێر.

وسمعت أبا مُسهَر، يُسأل عن الرَجُل: يَغلَطُ، ويُتَّهمُ، ويُصَحِّف؟ قال: بَيِّن أمره. فقلت لأبي مُسهَر: أترى ذالک مَنَ الغيبة؟ قال: لا.

تاريخ دمشق لأبي زرعة | ٨٢٥ كتاب المجروحين لابن حبان | **(٩٦/١)** الكامل في ضعفاء الرجال لابن عدي | **(٣١٦/١)** الكفاية في معرفة أصول علم الرواية للخطيب | ٩٣ ذم الكلام وأهله للهروي | ٦٩٧

**يحيى بن سعيد القطان** دەڵێ: پرسیارم کرد لە شعبة بن الحجاج، سفيان بن سعيد الثوري، سفيان بن عيينة، مالک بن أنس، دەربارەی پیاوێک حفظی خراپە یاخود تۆمەتبارە بە درۆزنی لە حدیثدا، هەموویان پێیان وتم: باسی بکە و حاڵی ڕوون بکەرەوە بۆ خەڵکی.

حدثنا عفان، قال: حدثنا يحيى بن سعيد، قال: سألت شُعبة، وسفيان بن سعيد، وسفيان بن عُيينة، ومالک بن أنس، عنِ الرَّجُل لا يحفظ أو يُتَّهم في الحديث، قالوا لي جميعًا: بَيِّن أمره.

العلل ومعرفة الرجال لأحمد | **(٤٦٨٥/٣)** كتاب المجروحين لابن حبان | **(٩٦/١)** الكامل في ضعفاء الرجال لابن عدي | **(٣١٢/١)** ذم الكلام وأهله للهروي | ٦٩٨

**محمد بن يحيى بن سعيد القطان** دەڵێ: باوکم بۆی گێڕامەوە وتی: پرسیارم کرد لە سفيان الثوري، شعبة بن الحجاج، مالک بن أنس، سفيان

بن عيينة، دەربارەی پیاوێک تۆمەتی درۆزنی لەسەرە، یاخود لاوازە، ئایا بێدەنگ بم لێی یاخود حاڵی ڕوون بکەمەوە بۆ خەڵکی؟ وتیان: ڕوونی بکەرەوە.

وأخبرني محمد بن إسماعيل، حدثنا محمد بن يحيى بن سعيد القطان، حدثني أبي، قال: سألت سفيانَ الثوري وشُعبة ومالِك بن أنس وَسفيان بْنَ عُيَينة عَنِ الرَّجُلِ تكُون فيه تُهمَة، أَو ضَعفٌ، أَسكُت أَو أُبَيِّن؟ قالوا: بَيِّن.

كتاب العلل للترمذي ا صـ : ٤

**أبو جعفر الحذاء** دەڵێ: بە سفيان بن عيينة ـم وت: ئەم إبراهيم بن أبي يحيى قسە لە قەدەر دەکات، وتی: بیدعەکەی بە خەڵکی بناسێنن، وە خۆتان داوای سەلامەتی و پارێزراوی بکەن لە پەروەردگارتان.

حدثنا أبو جعفر الحذاء، قال: قلت لسفيان بن عيينة: إنَّ هذا يتكلم في القدر -أعني إبراهيم بن أبي يحيى- قال: عَرَّفوا الناس بِدعته، وسَلوا ربكم العافية.

العلل ومعرفة الرجال لأحمد | **(٢/٢٢٩١)** كتاب الضعفاء للعقيلي | **(١/٧٣)** ذم الكلام وأهله للهروي | ٧٠١

**علي بن خشرم** دەڵێ: بیستم عیسى بن یونس دەیوت: لەگەڵ جەهمییەکان دامەنیشن، وە حاڵیان بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە بۆ ئەوەی بیان ناسن و خۆیانیان لێبپارێزن.

وَقَد كتَب إلي علي بن خشرم، سمع عيسى بن يونس، يقول: لا تُجالسوا الجهمية، وبَيِّنوا للناس أمرهم، كي يعرفوهم فيحذروهم.

نقض عثمان بن سعيد على المريسي للدارمي | ٥ ذم الكلام وأهله للهروي | ٧٠٣

**حرب بن إسماعيل الكرماني** دەڵێ: بیستم أحمد بن حنبل دەیوت: پیاو ئەگەر خاوەنی بیدعە بوو، وە بیدعەکەشی دەرخست، یاخود فاسق بوونەکەی دەرخست، ئەوە غەیبەتی نییە.

سمعت أحمد يقول: الرجل إذا كان صاحب بدعة يظهر ذالك، أو معلنا بفسقه، فليست له غيبة.

كتاب السنة لحرب الكرماني | ٦٥١

**حرب بن إسماعيل الكرماني** دەڵێ: پرسیارم کرد لە إسحاق بن راهوية دەربارەی ئەهلی بیدەع؟ وتی: هیچ ڕێز و حورمەتێکیان نییە.

سألت إسحاق عن غيبة أهل البدع؟ قال: ليست لهم حُرمة.

كتاب السنة لحرب الكرماني ا ٦٥٢

**حرب بن إسماعيل الكرماني** دەڵێ: پرسیارم کرد لە محمد بن بشار، وتم: پیاو غەیبەتی ئەهلی بیدەع دەکات؟ وتی: غەیبەتیان نییە، ئەمما ئەو وتەیەت دەڵێی: فڵانە کەس خاوەن بیدعەیە، ئەوە غەیبەت نییە. هەروەها وتەت لە حدیثدا دەربارەی ڕیجالی سەنەدەکان دەڵێی: فڵانە کەس غەڵەت دەکات، فڵانە کەس لە فڵانە کەس ثقە و سابت ترە، هاوشێوەی ئەم وتانە، ئەمە غەیبەت نییە، بەڵکو ڕوون کردنەوەی حاڵیانە بۆ خەڵکی.

وسألت محمد بن بشار، قلت: الرجُل يغتاب أهل البدع؟ قال: ليست لهم غيبة، ولا يعجبني، وأمَّا قولك: إنَّ فلانًا صاحب بدعة، فليس هذه غيبة. وكذالك قولك في الحديث: كان فلان يَغلط، وفلان كان أثبت مِن فُلان، ونحو هذا، فليس هذا غيبة، ولكنه تُبَيِّنُه للناس.

كتاب السنة لحرب الكرماني ا ٦٥٣

# سەرچاوەکان

١- تفسير مجاهد لأبي الحجاج مجاهد بن جبر القرشي المخزومي.

٢- جامع بيان عن تأويل آي القرآن لأبي جعفر محمد بن جرير الطبري.

٣- تفسير القرآن العظيم مسندًا عن الرسول ﷺ والصحابة والتابعين لأبي محمد عبدالرحمن بن أبي حاتم الرازي.

٤- جامع المسند الصحيح لأبي عبدالله محمد بن إسماعيل البخاري.

٥- المسند الصحيح لأبي الحسين مسلم بن الحجاج النيسابوري.

٦- سنن أبي داود لأبي داود سليمان بن الأشعث السجستاني.

٧- الجامع المختصر من السنن لأبي عيسى محمد بن عيسى الترمذي.

٨- المجتبى لأبي عبدالرحمن أحمد بن شعيب النسائي.

٩- سنن إبن ماجه لأبي عبدالله محمد بن يزيد بن ماجه القزويني.

١٠- سنن الدارمي لأبي محمد عبدالله بن عبدالرحمن الدارمي.

١١- مسند أحمد لأبي عبدالله أحمد بن محمد بن حنبل الشيباني.

١٢- كتاب الزهد لأبي عبدالله أحمد بن محمد بن حنبل الشيباني.

١٣- العلل ومعرفة الرجال لأبي عبدالله أحمد بن محمد بن حنبل الشيباني.

١٤- مسند ابن الجعد لأبي الحسن علي بن الجعد بن عبيد الجوهري البغدادي.

١٥- المصنف لأبي بكر عبدالله بن محمد بن إبراهيم أبي شيبة القيسي.

١٦- كتاب العلل لأبي عيسى محمد بن عيسى الترمذي.

١٧- تاريخ أبي زرعة الدمشقي لعبدالرحمن بن عمرو بن عبدالله بن صفوان النصري.

١٨- نقض عثمان بن سعيد على المريسي الجهمي لأبي سعيد عثمان بن سعيد الدارمي.

١٩- كتاب البدع لأبي عبدالله محمد بن وضاح القرطبي.

٢٠- كتاب السنة لأبي محمد حرب بن إسماعيل بن خلف الكرماني.

٢١- كتاب السنة لأبي بكر أحمد بن عمرو ابن أبي عاصم.

٢٢- كتاب السنة لأبي عبدالرحمن عبدالله بن أحمد بن محمد بن حنبل الشيباني.

٢٣- كتاب السنة لأبي بكر أحمد بن محمد بن هارون الخلال.

٢٤- كتاب الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر لأبي بكر أحمد بن محمد بن هارون الخلال.

٢٥- كتاب السنة لأبي عبدالله محمد بن نصر بن الحجاج المروزي.

٢٦- تعظيم قدر الصلاة لأبي عبدالله محمد بن نصر بن الحجاج المروزي.

٢٧- كتاب القدر لأبي بكر جعفر بن محمد بن الحسن بن المستفاض الفريابي.

٢٨- كتاب الضعفاء لأبي جعفر عمرو بن موسى بن حماد العقيلي.

٢٩- شرح السنة لأبي محمد الحسن بن خلف البربهاري البغدادي.

٣٠- آداب الشافعي ومناقبه لأبي محمد عبدالرحمن بن أبي حاتم الرازي.

٣١- كتاب المجروحين من المحدثين لأبي حاتم محمد بن حبان البستي.

٣٢- روضة العقلاء وما يحتاج إليه الملوك والنبلاء لأبي حاتم محمد بن حبان البستي.

٣٣- كتاب الشريعة لأبي بكر محمد بن الحسين الآجري.

٣٤- الإبانة عن شريعة الفرقة الناجية ومجانبة الفرق المذمومة لأبي عبدالله عبيدالله بن محمد بن حمدان بن بطة العكبري.

٣٥- الشرح والإبانة على أصول الديانة ومجانبة المخالفين ومباينة أهل الأهواء المارقين لأبي عبدالله عبيدالله بن محمد بن حمدان بن بطة العكبري.

٣٦- الكامل في ضعفاء الرجال لأبي أحمد عبدالله بن عدي الجرجاني.

٣٧- الإعتصام بالعزلة لأبي سليمان حمد بن محمد بن إبراهيم بن خطاب البستي الخطابي.

٣٨- حلية الأولياء وطبقات الأصفياء لأبي نعيم أحمد بن عبدالله الأصبهاني.

٣٩- الكفاية في معرفة أصول علم الرواية لأبي بكر أحمد بن علي الخطيب البغدادي.

٤٠- الفقيه والمتفقه لأبي بكر أحمد بن علي الخطيب البغدادي.

٤١- شرف أصحاب الحديث لأبي بكر أحمد بن علي الخطيب البغدادي.

٤٢- تاريخ بغداد لأبي بكر أحمد بن علي الخطيب البغدادي.

٤٣- جامع بيان العلم وفضله لأبي عمر يوسف بن عبدالله بن محمد بن عبدالبر القرطبي.

٤٤- الانتقاء في فضائل الأئمة الثلاثة الفقهاء لأبي عمر يوسف بن عبدالله بن محمد بن عبدالبر القرطبي.

٤٥- كتاب أصول السنة لأبي عبدالله محمد بن عبدالله بن أبي زمنين الإلبيري.

٤٦- شرح أُصول اعتقاد أَهل السنة والجماعة لأَبي القاسم هبة الله بن الحسن بن منصور الطبري اللالكائي.

٤٧- مناقب الشافعي لأبي بكر أحمد بن الحسين بن علي البيهقي.

٤٨- ذيل مناقب الشافعي لأبي بكر أحمد بن الحسين بن علي البيهقي.

٤٩- ذم الكلام وأهله لأَبي إِسماعيل عبدالله بن محمد الهروي.

٥٠- الحجة على تارك المحجة لأبي الفتح نصر بن إبراهيم المقدسي.

٥١- الحجة في بيان المحجة في شرح التوحيد ومذهب أهل السنة لأبي القاسم إسماعيل بن محمد بن الفضل قوام السنة الأصبهاني.

٥٢- طبقات الحنابلة لأبي الحسين محمد بن الحسين أبي يعلى الفراء البغدادي.

٥٣- مناقب الإمام أحمد بن حنبل لأبي الفرج عبدالرحمن بن علي إبن الجوزي البغدادي.